# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سەرەکی ئەنجومەنی کارگێری
وسەرنووسەر

مصلح جەلالی

سکرتێری نووسین
عبدالوهاب تالەبانی



نەخشەکێشان و سەرپەرشتی هونەری
هناء صباح
خەت و مۆنتیف:
نزار بەزاز

لەم ژمارەیەدا



دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی
.مەیدانی خەلانی ـ بەغدا ـ
ت 8875795 (5) خەت

وێنەی هەردوو بەرگ: فارس سعدی

«شفيق محمود حسن»



لەگەڵ شكۆفەی شەبەقی بەرەبەیاندا، لەگەڵ جریوەی مەل و قاسپەی كەوی بنارو دۆڵ و شاخە بەرزەكانی كوردستاندا، گەلی كوردمان لەگەڵ ئەو شكۆفە یەدا . . لەگەڵ بەرز بوونەوەی رۆژی ئەو رۆژەدا . . رۆژی «11» ئاداری پیرۆزدا، ئاهەنگی یادی ئەورۆژە مەزن و پیرۆزە ئەگێرن . . یادی چەسپاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی ناوچەی كوردستان . . ئەم یاسایە كە بەرهەمێكە لە بەرهەمەكانی پیت و بەرەكەتی ئەو بیروباوەڕە شۆڕشگێڕو مرۆڤایەتی یە و مێژوویە كە نمونەی نیشانەی وەدەست هاتێكی لە ژیانی عیراقیەكاندا كە هەنگاوێكی فراوانی دەنێ بەرەو پێشكەوتن و پەرەپێدانی كوردستانی خۆشەویستمان.

عیراقیە سەربەرزەكان، كاتێ لە ئاهەنگی وپەیرەوی ئەو یادەدا ئەژین یادی چەسپاندنی بەیاننامەی «11» ئاداری «1974» سەیری ئەو ساڵانە دەكەن كە تەژی بوو لە بەخشین وپەرەسەندن كە هەموو رووەكانی ژیانی گردۆتەوە . . ئەم گەلە سەیری ئەو ساڵانە دەكەن هەمان شێوەی ژیانی ئەم ساڵانەیان كە پتر رووی لە پەرەسەندن و ژیانێكی خۆش گوزەرانیو بەختەوەریو هێمنیو ئاسایشی كردوە . . هەمیشە هەستی تواناداری خۆی دەردەبریو ئامادە بوونی لەگەڵ رێبازداو پەیمان و بەڵێن تازە كردن لە پێناوی بەرگری كردن لە عیراقی خۆشەویستمان و ئەم تاقی كردنەوە نوێو مێژوویە كە لە عیراقدا . . عیراقی یەكێتیو سەربەستیو سۆشیالستی، لە دایك بووە بەسەر كردایەتی سەرەك پێشەوای قارەمانمان هەڤاڵی تێكۆشەر صدام حسین.

ئەم یادە پیرۆزە كە هەوڵێكی مەزنی بۆ دراوە لە پێناوی راپەڕاندن و پەیرەوی كردنیدا . . پەیرەوی كردنی هەموو ئەو وشانە كە لەیاساكەدا هاتوە بەپێی پەیمانێ كە دراوە لەلایەن سەركردایەتی پارت و شۆڕشەوە، لە سەرویاندا سەرەكی پێشەوا هەڤاڵی تێكۆشەر سەرەك صدام حسین بۆ رۆڵەكانی گەلی كوردمان كە لە پێناوی عیراقدا ئەجەنگن، هەر وەك لە پێناوی ئەم یاسایەدا جەنگاون كە پاش ئەوەی بەروونی بۆیان دەركەوت كە چارە نووسی پاشە رۆژیان بە دەستی خۆیانەوەیە بۆ نەهێشتنی پاشكەوتن و هەژاریو نالە باری وژێر دەستی ئەوانەی كە بیرو فكرێكی نامرۆڤایەتی دەكەنەوە بۆ مانەوەی ئەم گەلە خۆشەویستمانە كە هەمیشە لەژێر چەتری ژیانێكی رەش وتەسك و تاریكیدا بێت . . بەڵام بەرز بوونەوەی شكۆفەی بەرەبەیانی ئەو رۆژە پیرۆزە لەگەڵ بریاری شۆڕشگێرانە . . بەسەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی كوردستادا لە نێو یاسای ئۆتۆنۆمیدا وهەستان بە پەیرەوی كردنێكی زووبەزوویی بەشێوەیێكی شۆڕشگێرانە و پارێزی كردنی لەلایەن رۆڵەكانی گەلی كوردمانەوە گواستنەوەیێكی بەرزی هێنایە كایەوە لە ناوچەدا لە نێو ئەو گورانكاریانەوە



که له کانگـەیێکی راستـەقینـەوە کولاّوە بەرەو ژیـانێکی کامـەرانی وبـەختـەوەری وهێمنی و ئاسـایشی . . هەروا رورەش کردنی دوژمنانی گەلی کوردمان له نێو بەرز بوونە وەی ئەو باڵـە خێرمـەنـدە کە سێبـەری خۆی کێشـا بەسەر ناوچـەدا . . بە بلاّوبـوونـی پرۆژە مروڤـایـتـی یەکـان و پەروەردەیی و ئاوەدانی و ئامادە کردنی هەموویێداویستەکانی ژیان له ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستاندا .

گەر هات و ئێمـە ئەو رۆژە یاد ئەکـەینـەوەو ئاهـەنگ ئەگێرین پێویستە رووبکەینە سێبەری ئەو دەستکەوتە مەزنانە کە شۆرش وەدیی هێناوەو بەخشینێکـە له بەخشینـەکـانی شۆرش بۆ گەلی کوردمـان له کاتێکـا له جەژنـە نەمرەکانی سەرکەوتنەکانیدا ئەژێ ـ سەرکەوتنەکانی قادسیەی صدام ـ ی پیرۆز .

بێگـومـان بەیـاننـامـە مێـژوویيەکەی 11یئادار، وەنەبێ ئەنجـامێـك بێت له وەدی هێنـانی ئارەزووی لایـەنیك، یان کەسـانێـك بێت . . بەڵکـو ئەنجـام و ئاوێنەی ئامانجەکانی بیـرو باوەرەکـانـی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیـالیست و روانگـە مرۆڤـایتی و دیمـوکراسیەتێکەی بووە، لەبارەی باری ژیانی ئاسایشی له نێو نەتەوەکاندا ـ لەهەرێمی عیراقدا ـ هەروا دەورێکی گرنگی هەبـوو له چەسپـانـدنی هەستی برایەتی و یەکگرتوویی له نێوانیاندا بەیەك هەست ویەك دڵ و یەك دەروون له پێناوی لێدان و بن گۆر کردنی هەر پیلان و دەستدرێژ یەك رووەدات دژی عیراقی پیرۆز و خۆشەویستمان .

لەو هەستـەوە گەلی کوردمـان بەدلێـری و چاونەترساوی و بەشـەرەفـەوە دژی بەکـرێ گیـراوان له ناوچـەدا جەنگـا وچەندەها شەهیدانی بەخشی لەو پێناوەدا . هەروەش ئێستا ئەوا بەهـەمـان هەست و بیـروبـاوەرە له بەرەکـانی جەنگدا دژی رژێمی ئێـرانی درنـدەی خومێنی ئەجـەنگی وروحی شەهیـدان ئەبـەخشێ له پێنـاوی پارێـزی کردنی نیشتمانی پیرۆزماندا له هەمان بەخشینە بەرزەکانی تاقی کردنەوەکەی چەسپاندنی ئۆتۆنۆمی . . بایەخ دان و دان نانی سەرکردایەتی پارت و شۆرشـە بەجـەژنی نەورۆزی نەمـرمـان نەورۆزی گەلـی کوردمــان له رێکـەوتی «21» مانگی ئاداردا، کە جەژنێکی نیشتمانیە بۆ هەموو گەلی عیراقمان .

بێگومان هەر ووشەیێکی کوردی دەربـرینێکە له رووی چەنـدی ئەو دوستکـەوتـە مەزنـانـە کە وەدی هێنـراون بۆ رۆڵەکانی ناوچەی کوردستان بەتایبەت لەم کاتە ناسکەدا کە هەرێمە تێکۆشەرەکەمان تیادایە وپێدا دەروا . . لەم رووەوە ئێمـەش دەوری مێـژووی خۆمـان ئەبینین بۆ وەدی هێنـانی مەزنترین دەستکـەوت له ناوچـەدا له ژێـر سایـەو سێبەری شۆرشی «17 ـ 30» کە لاوێـژی پیـرۆزمـانـدا بەسـەر کردایەتی رولـە وقـارەمـانی عیـراق سەرەکی پێشـەوا هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین . .

# ئاوردانەوەیەکی پڕ فەڕو پێشکەوتن لە رۆشنبیری گەلی کورد

ـ شاخەوان ـ

لەسەرکەوتنی شۆڕشی 17 ـ 30ی پیرۆزە تەموزی مەزنی سالّی 1968 بەدواوە گەلی کوردمان لە کوردستانی عیراقدا پێشکەوتنێکی زۆر گەورەی لە هەموو مەیدانێکی گەشەسەندندا بەخۆیەوە بینی کە یەکێ لەوانە مافی رۆشنبیری گەلی کوردمان بووەو رۆشنبیرانی کورد لە بواریو کەم دەسەلاتیو بارگرانی ئەرکی چاپ و چاپەمەنیو

بلاوکردنەوەی بەرهەم و نەبوونی هاندان و باوەش نەگرتنەوە بۆ بەرهەمەکانیان پەڕینەوە بەری پشت گرتنی تواناو بەهرەو پێشخستنی باری رۆشنبیریو لایەن گرتنی بچووکترین بەرهەمی رۆشنبیران ئەمەش بە دامە زراندنی چەندان چاپ و هەرزان کردنی کەرەسەی چاپ وچاپەمەنی دانان و کردنەوەی گەلێ دەزگای رۆشنبیریو بەرزکردنەوەی پلەی ئەو لایەنانەی کە بۆ بایەخدان بە باری رۆشنبیریو سووك کردنی ئەرکی چاپ و چاپەمەنی هێنرابوونە کایەوە. . لەم رووەوە گەلی رۆژنامەو گۆڤار هاتنە کایە. . وەك رۆژنامەی هاوکاریو گۆاری بەیان و رۆشنبیری نوێو دەیان گۆارو رۆژنامەی ترو پێکهێنانی زۆر بەشی هاندەری ئەم لایەنانە.

رۆشنبیرو هونەرمەندو خوێندەواری گەلی کورد پەیتا پەیتا بەرە و پیری ئەم باوەش گرتنەوەی سەرکردایەتی شۆڕشی 17 ـ 30ی مەزنی تەموز چوون و بەسەدان شاعیرو زانایانی نەتەوەی کورد کە بەرهەمەکانیان لە کونج و کەلەبەری مالّان و مزگەوتەکاندا گەردی سالّەهای سالّ گرتبوونی وژەنگیان هێنابوو لە دەستی لە ناو چوون رزگار کران و چاپ کران.

لەم رووەوە گەلێ دەسگاو بەرێوەبەرایەتی ئەرکی زیندوکردنەوەو پێشخستنی کەلەپوورو هونەرو رۆشنبیری گەلی کوردیان گرتە ئەستۆ ئەویش بە یارمەتیدانی چاپ کردنی بەرهەمی رۆشنبیرانی کورد کە یەکێ لەوانە دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی بوو ئەم ئەرکانەی خستە سەر شانی خۆی بەچاپ کردنی ئەو بەرهەمانە لەسەر ئەرکی خۆیو توانی کە سەدان بگرە هەزاران بەرهەمی نووسەران چاپ بکات و بەرامبەر بەم کارەش پارە بەخاوەنی بەر هەمەکان بدات و پشتیان بگرێ.

بێ گومان ئەم لا لێکردنەوەی سەرکردایەتی شۆڕش لە رۆشنبیری نەتەوەی کورد ئاسۆیەکی فراوانی لە بەر دەم هەموو بەهرەدارێکی کورد دا کردەوە کەبێ ترس و بێ کۆسپ هەنگاوی گەورە بەرەو پێشخستن و پتەوکردن و گەشە پێدانی بەرهەمەکان و نووسینیان بنێن و ئەو توانایەی هەیانە بەهێز ترو روناکی بکەن.

ئەمە لە لایەك. . لەلایەکی ترەوە ئەو بەرهەمدارە سەرەتاییانەشی کە تازە دەستی هونەریان وەکارناوە کاتێ خۆیان لە جیهانێکی روناکی پڕ نووسین و سەرچاوەو نامەخانەیەکی زۆر و زانکۆی کوردیو کۆڕو دەزگاو

بەڕێوەبەرایەتی و گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردیدا بەو بەرفراوانی وزۆری‌یەو کاتێ خۆیان لە ئاستی ئەو هەموو هاندان و ڕێ نەگیراوی‌و بایەخەی شۆڕشی 17 ـ 30ی تەمموزدا دیـەوە. . وەك تینـویـەکی ڕێگـەی دووری بێ ئاوو بێ پشوودان کاتێ کە ئەگەنە سەر کانیەکی روونی سازگارو بێ گەرد بێ ڕێ لێگرتن بە ئارەزووی خۆیان تینوێتی دوورو درێژی ئەو ڕێگەیەی چەندان ساڵە ئەشکێنن و ئەحەوێنەوەو دەم و چاوو بیـرو هەستیـان فێنـك ئەکـەنەوەو وەك خونچەی بەهـار توانـاکـانیان ئەگەشێنەوە. . ئەم بەرهەمدارە تازانەش بێ ئەوەی بەرهەمەکانیان بە منداڵی سەر بنێتەوەو بمرێ. . زیندوانەو بە تواناییانە، بێ گیرو گرفت دەسەڵات و بەهرەی خۆیـان تێکـەڵی کاروانی ڕۆشنبیـری گەلی کوردمان کردوو لەگەڵ کاواندا سەر بەست و پێشکەوتوو ڕۆشتن.

ئەم جیهـانـە فراوانـەی ڕۆشنبیـری گەلی کوردمـان کە ئەنجـامی سەرکـەوتنی شۆڕشی 17 ـ 30ی پێشکـەوتووی تەموز درووست بوو. . جیهانێکی نوێ ـ بەهارێکی گەش و رازاوەو ساماڵ . . پرشنگێ کە هەموو کون و کەلەبەرێکی تاریکی روونـاك کردەوە. . ئەم جیهـان و ئەم بەهـارو ئەم پرشـنـگـە لە (9ی ئاداری سـاڵـی 1983)دا لە لایـەن سەرکـردایـەتی شۆڕشـەوە. . لەلایەن هەڤاڵ صدام حسین ەوە لە هۆڵی (قصر الثقافة والفنون) لە بەغدا ئاوڕێکی زۆر گەورەتـرو بایـەخـدارتر لەم لایەنانە درایەوە کە ئەویش ئەوەبوو بەرێزیان لەو کۆڕەدا ئامادە بوون کە دەسگای ڕۆشنبیری‌و بلاو کردنەوەی کوردی بۆ ڕۆشنبیرانی کورد پێکی هێنابوو. . ئەم ئامـادەبـوون و ئاوڕ دانـەوەیـەی بەرێـز سەرکـردەی پێشکـەوتن و بەهێـزکـردنی گەلی عیراق لە محکەم کردن و گەشـە پێـدانی ڕۆشنبیـری‌و ڕۆشنبیـرانی گەلی کوردمـان تەنـانـەت ئەو بیـرو پێنـووسـانەشی خستەوە گەڕ کە تەمەنی زۆرو کەمتەرخەمی لەگەڕ رایوەستاندبوون.

دوای ئەم ئاوڕ دانـەوەیـەی سەرەکی فەرمـانـدە صدام حسین لە نووسـەرانی کورد دەستـە دەستـە نووسـەران و هونـەرمـەنـدو خوێنـدەوارانی کورد خەڵات کران و ئەوە بوو دەزگـای ڕۆشنبیـری‌و بلاوکـردنـەوەی کوردی لەبـەر ئەم روونـاکی‌یـەدا خەڵاتی تایبـەتی تەرخان کرد بۆ پێشەبرکێی چیرۆك و شیعری کوردی. . ئەو چیرۆك و شیعرە کوردیانە کە پەیـوەنـدیـان بە پێشکـەوتن و یەکێتـای ئەمرۆی عیراق و عیـراقی‌یـەکـان و بە جەنگی رەوای قادسیـەی صدام ەوە هەیـە. . ئەو جەنگـەی کە لەلایـەن ڕژێمی نەزانی ئێرانەوە بەسەر گەلی عیراقماندا سەپێنرا. . ئەم ئاوڕ دانەوە پڕ فەڕو گزنگـدارەی کە لە لایـەن سەرکـردایـەتی شۆڕشـەوە بە خوێندەوارو نووسەری کورددرا. . پایەی ئەو خێوەتەی زیاتر پتـەو جێگیـر کرد کە برایـەتی کوردو عەرەب لە سایـەیـدا بەخـۆشی‌و کاری بێ هاوتـاو لێبـوردن و دڵسـۆزیـان بۆ سەرکـردایـەتی شۆڕش پاراستنی و سەربـەستی عیـراق و بەرگـری کردن لەو دەسکـەوتـانـەی کە لەپـاڵ ئەو شۆڕشـە مەزنەدا دەستیان کەوتووە تیایدا ئەژیان.

بەڵی لاکردنەوەی سەرەکی فەرماندە بەرێز صدام حسین بەتایبەتی لە (9ی ئاداری ساڵی 1983دا) لە ڕۆشنبیران و خوێندەواری کورد. . وای لە گەلی کوردمان کرد کە زیاتر هەست بە دڵسۆزایەتی‌و بایەخی سەرکردایەتی شۆڕش و ئەو دەربەست بوونە بکەن کە سەرکردایەتی شۆڕش بەرامبەر بە گەلـی کوردمـان هەیـەتـی‌و ئەم کارەش ورەی بەرزی کوردەکانی لەبەرەکانی جەنگ و لە هەموو بوارو مەیدانێکدا بۆ پراستنی رەوتی پێشکـەوتـوو سەربـەستی‌و سەرکردایەتی‌و ئەو بەرهـەمـدانـدا زیـاتـر خۆیان ماندوو بکەن کە لەسایەی رەوتی روونی کاروانی شۆڕشـەوە دەستیـان کەوتـووەو تەواو بۆیـان دەرکـەوێ کە سەرکـردایـەتی ئەیـەوێ ڕۆشنبیـری عیراقی‌یەکان کوردو عەرەب شان بەشانی یەك بڕوات و لە نێوان گەلانی جیهاندا پایەو ڕێزی دەرکەوتوو بەهرەداریان هەبێ.

هەر بژی یادی (9ی ئاداری ساڵی 1983) هەر شەکاوە بێ ئالای سەرکەوتنەکانی عیراق و پتەو تربێ ئەو دەسکەوتە مەزنانەی کە گەلی عیراقمان بە کوردو عەرەبەوە دەستی کەوتووە.

# بەرگرییەك لە

# عەلی بەردەشانی

زیاد محمد امین

گەڕان بەدوای کەلەپووورداو، کۆکردنەوەو، وەدەرخستنی لەسەر ڕووپەڕی گۆڤارو ڕۆژنامان ڕزگار کردنیەتی لەتێدا چوونێ، کە ئەوەش کارێکی پیرۆزو دڵسۆزانەیە بۆپاراستنێ ڕۆشنبیریی کۆنینانمان و کەڵك لێوەرگرتنی لەئێستاو دوارۆژدا.

**لە ژمارە 86ی ئاباری 1983ی گۆڤاری بەیاندا لە لاپەڕەی (70 ـ 71)دا.**

پارچە هەڵبەستێکی عەلی بەردەشانی لەلایەن کاك (اسماعیل تەنیا)وە لەژێر ناونیشانی (پارچە شیعرێکی بڵاو نەکراوەی عەلی بەردەشانی بڵاوکرایەوە.

لەبەر ئەوەی کە ئەم پارچە شیعرە کەم و کورتییەکی زۆری تێدا بەدی دەکرێ بەپێویستم زانی کە هێندێك لایەنی کەم و کورتیەکانی دەست نیشان بکەم و دەقە تەواوەکەشی کە لە بەڕێزان (حاجی حوسێن دەشتێوی و برایمی ئەحمەدی برایمی) وەرم گرتووە بیخەمە بەرچاوی خوێندەوارانی خۆشەویست.

ئەمانەی خوارەوەش هێندێك کەم و کورتی دەقە بڵاوکراوەکەی کاك (اسماعیل)ن.

1 ـ ئەو پارچە هەڵبەستە کە بە (بەیتێ پیوازان) ناسراوە هیچ (عینوانێکی) بۆ دانەندراوە.

2 ـ نووسیویەتی بەسەرهاتێکە کە بەشیعر هەڵی بەستووە، بەڵام بەسەرهاتەکەی ڕوون نەکردۆتەوەو خوێندەواریش هیچ لەو بەسەرهاتە تێ ناگات.

3 ـ هەڵبەستەکە لەشوێنێکی ناسکدا گردەبڕ قرتاوەو کۆتایی هاتووەو هیچ ئەنجامێك بەدەستەوە نادات، کە بەشێکی خۆشی دەکەوێتە کوتاییەوە، کە شەڕە بەندی عەلی و پیرەژنێ دەست پێ دەکات.

4 ـ هەوێنێ ڕوودانێ ئەم بەسەرهاتەی پیرەژنێ خاوەن دەرماڵە پیوازە، کەچی لەو دەقەیدا بێ ناوە. پیرەژن ئەوەندە شایەرێکی بەند سواربووە کە زۆر لەعەلی کەمتر نەبووە.

پیـرەژ ن گرۆیـەکـەی دۆڕاندووە بەڵام نەبەزیوەو تەوارانە[1]

داهـاتـۆتـە عەلی و ئەو کاریکـاتێرەی ئەو لەو بەندەیدا دروستی کردووە مەگـەر هەرلەدەست کەڵە شاعیرێکی وەکو شێخ ڕەزای تاڵەبانی هاتبێ ! : -

**ئافەرم عەلی بوگوتنت**
**سەلکە توورێك**
**سەلکی بڕواو پەلکی بمێنێ**
**هەر با لێیداو بیشەکێنێ**
**خەڵکی وەپێکەنین بێنێ .**

5 ـ پێـویست بوو ئەو سەرچـاوە دیـاری بکـرێ کە ئەم شیعرەی لێ وەرگیراوە .

6 ـ هەروەکو ناوی کاکەسواری شاگردی عەلی بەردەشانی لە کتێبـە (هەڵبژاردە لەشیعری فولکلۆری کوردی)یەکەی کاك (فـاروق حەفیـد)دا لەبـەیتێ (دۆڵەبی)یەدا بێ سەروشوێنە ، وەسمـانی شاگـردیش لەو دەقـەی بەیتی پیـوازانـدا لەهـەمـان دەریای بێ سەروشوێندا بزرە! کەشاگردەکان بەندیان بۆعەلی ستـانـدوونـەوەو حەسـانـدوویـانـەتـەوەو ماوەی بیـرکردنەوەی بەنـدانیان بۆ فراوان کردووە، بۆیە پێویستە مافی ڕەوای خۆیان بدرێتێ و ناویان وون نەبێ .

ئەوەش دەقی هەڵبەستەکەیە کە لە بەڕێزانی ناوبراو وەرم گرتوو:

### بەیتێ پیوازان

سێ شایـەربـوون ، حەمـەووەسمـان و عەلیـەکـوێـری بەردەشانی ، هەرسێکیان شایەری چاك و دەنگ خۆش بوون و دێ بەدێ و شار بەشار دەیان بردن بۆشایی و داوەتان .

ڕۆژێکی لەشـاری پاشـای بەبـان[2] لەبەر ماڵێکی گەیشتنە پیـرێژنێکی لە بەربەڕۆچکێ[3] خۆی هەڵ خستبوو. پیرێژنێ لەبەر دەرکێ دەرماڵێکی پیواز هەبوون .

شایەرەکان ڕوویان لەپیرێژنێ نا[4] بۆ دووچڵ پیواز، گوتیان :

(پیـرەدایی ، بۆ سەرشـایی یە دەچین ، دووچڵمان پیواز دەیە



بیخۆین، دەنگمان پێی‌ساز دەبێ). بەڵام پیرێژن رووی شکاندن و دووچڵ پیوازەکەی نەدانێ و هەیدێی کردن.[5]

شایەرەکان گوتیان: (وەڵلاهی، واپێویستە ئەمە شایی‌یەکی لەبەر دەرکێ پیرێژنێ سازدەین و ئەوشۆ هەموو پیوازەکانی هەڵقەنین).

بۆ شەوێ لەبەردەرکێ پیرێژنێ دەستیان کرد بەگوتنێ... و خەڵکیان لێ گرد بووەو شایی دابەستراو دەست کرا بە هەڵپەرینێ. پیرێژن ئارەزووی شایی‌یەی بزووت، هەستا چووە ناو شایی‌یەکەوەو دەستی سەرچۆپیەی گرت و دەستی کرد بە هەڵپەرین و دەسرۆکە راوەشاندنێ. ئەوجا عەلی دەستی بە بەندگوتنێ کرد:

عەلی:
هۆ، کاکی من رەنگە جینگەنە[6]
گوارەو کرمۆک و ژێر چەنە
چم پێ‌گوتی؟ هەڵیان قەنە!
سوور گوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەر نازی دەتۆ!

حەمە:
هۆ کاك عەلی رەنگە بەدەوێ،
سەبرت بی تا نیوەشەوێ،
پیرێژن خەوی لێ‌بکەوێ،
سوورگوڵ لەباغان جەنەتە
سووری لەبەرنازی دەتۆا

عەلی:
کاکە حەمەی رەنگە جوندی‌یە
ئەو شۆ شایی‌و زەمزەمی‌یە
داکێ ئاگای لەکوری نی‌یە
هەڵیان قەنە فایدەی نی‌یە
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەر نازی دەتۆ!

حەمەی شایەر ئەگەر وای گوێ‌لێ‌بوو! رۆیشتە نێو دەرماڵە پیوازەکێ بۆ پیواز هەڵقەندنێ، بەڵام بنکیان رەق بوون، هەڵنەدەقەندران و هەڵدەپرچکان، جا گوتی:

هانام بەرشێخی ئەشکەنێ[7]
دڵم کۆلکی دارەبەنێ
بنیان رەقەو هەڵناقەنێ
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەرنازی دەتۆ!

عەلی:
خۆ تۆ کوێرنی‌و چاوت هەیە
جوگەی ئاوێی لەپشتەوەیە
بەری بگرەو بەری دەیە
گەلای بگرەو سەلکی هەیە
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەرنازی دەتۆ!

ئەوجار حەمە جوگەلە ئاوی وەنێو پیوازان گێڕاو دەستی کرد بەپیواز هەڵقەندنێ و ئەو بەندەی بادایە نێو شایی‌یەو گوتی:

هانام وەبەر شێخی کۆسە
گوتنم دی لە هەوەسە
ئامێزێکان بێنم بەسە؟!
سوور گوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەر نازی دەتۆ!

عەلی:

بەکەلامێ میر خدری
تۆ شەیتانی یان شبری
هەموان بەبەستە بگری
گەر لەخێزانی فکری
چلێك بمێنێ سەرناگری
بەکوڵێیان دەبەر بری
دەبێ کەری هەڵیان گری
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەر نازی دەتۆ!

حەمە:
نێو دەرماڵێ بەقورو ئاوە
بڕ بەبڕم هەڵکێشاوە
ئەرکم لەپیرێژنی داوە
بەبێ گوریسیم لێ‌قەوماوە
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەرنازی دەتۆ!

عەلی:

دەبڕۆ ماڵێ مام ئیدریسی
کێچ هەڵنیشتوون لەسەر لیسی
هەر لەوێ ئاودە گوریسی
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەرنازی دەتۆ!

حەمە:
هانام بەر شێخی مەروێیە
چەند گەڕاوم دێ بەدێیە
نازانم خانەخوێم کێیە؟!

سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەرنازی دەتۆ!

عەلی:
خاڵە حەمە تۆم گێچەڵی
خاڵە حەمە توندو تەڵی
بڵند دەبی وەك خەرتەلی [٥]
قوڵپان دەدەی وەك مەنجەڵی
دەڵێی مانگایە بەکەڵی
بیانبە بۆ ئاڵلا کەچەڵی
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووری لەبەرنازی دەتۆ!

حەمە بەکوڵە پیوازەوە ڕۆیشت بۆماڵێ ئاڵلا کەچەڵی ماڵەوێ هەرچەندی لەدەروازێدا کەسی لێ وەخەبەر نەهات! ناچار لەدەرکێڕا بەندێکی بادانێ و گوتی:

هانام وەبەر شێخی تازە
کوڵەکەم هەموو پیوازە
دالێم وەکەن ئەو دەروازە
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەرنازی دەتۆ!

ئەنجا کوێخا ئاڵلا وەخەبەرهات و گوتی: منداڵینە، هەستن لێی وەکەن، خۆ دەڵێ: (کوڵەکەم هەموو پیوازە).
منداڵ هەستان دەرکەیان لێ کردەوە، ئەویش کوڵە پیوازەکەی حەوڵەی ژووریێ کردو گەڕایەوەو بەندێکی بادایە نێو شاییەو گوتی:

بەقورعانێ میر وەتمانی
گەربێنەوە بە چەسپانی
دوو چلانیان لێ بخۆن بەنانی

لەرزو نامێنێ لەگیانی
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەر نازی دەتۆ

عەلیەکوێری بەردەشانی ئەگەر تەماشای دەرماڵەکەی کرد شینایی تێدا مابوو! جاگوتی:

سوێند بە هەقی ئیللەڵلایە
سی جزمی کەلامولڵایە
شینایی‌یە دەبینم مایە
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەر نازی دەتۆ!

حەمە:
بەوخالقی بەحەواوە
تورەزەلەی (٩) سەرلێکداوە
تەرکم لەپیرێژنی داوە
چلێکی پیواز لێ‌نەماوە
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەر نازی دەتۆ!

عەلیەکوێریش بۆ ئەوەی شایی‌یەکە ببرێتەوە فرێکی بادایە حەمەی و گوتی:

خالّە ئەمە من نەماوم
هێ برا! حەمە من نەماوم
وەك گیسکەڵی تازە زاوم
لەسەرمان زۆر پەشۆکاوم
پیرێژن پێلاوت سەرچاوم
سوورگوڵ لەباغان جەننەتە
سووریێ لەبەر نازی دەتۆ!

پیرێژن ئەگەر هەوڵی شایی‌یە دەستەسری سەرچۆپی‌یەی گرتبوو، نەیدابوو بەکەس! وای کەللە گەرم داهاتبوو ئاگای لەخۆی نەمابوو! ئەگەر گوێی لێ‌بوو عەلیەکوێر گوتی: (پیرێژن پێلاوت سەرچاوم)، پیرێژن گوتی: (دەی، پیرە دایی و دەبەرمری تۆزێکی دیشی لەسەربرۆن).

جا عەلیەکوێر گوتی: (پیرێژن، سازی بەرەکەتی نی‌یە!

ئەمە ماندوو بووین و برسیمانەو دەچینەوە ماڵێ خانەخوێی، شایی‌یە بەردەو خوات لەگەڵ).

عەلیەکوێرو حەمەو وەسمان چوونە ماڵی ئاڵڵا کەچەڵی، پیرێژنیش بەشایی‌یە ئەوەندە ماندووبرسی ببوو!

هەر ئەگەر شایی تەواو بوو تاوی دایە نوردووە (٩) نانێکی و وەبن هەنگڵێ خۆیداو رۆیشتە نێو دەرماڵێ پیوازان و پریدایە شینایی‌یەو لەنێونانی ناو کردی بەبابۆڵەو دەستی بەخواردنێ کرد، جارێ نانێکی هەر بەسەڵمکێ خوارد، ئینجا گوتی: (عەجەبا، جاران ئەگەر پیوازی خۆم دەخواردن، تیژ و سوێرو خۆش بوون! ئەدی ئەوشۆ بۆ تاڵ و تفتن!؟).

پیرێژن تەماشای پیوازانی کرد، قەت برێکیان تێدا نەمابوو!

گوتی: (نەء، ئەوبەیت و باوەی ئەوشۆ هەموو بۆپیوازی من بوون! سبەینێ دەچمە شکایەتێ کن پاشای بەبان.

سبەینێ پیرێژن رۆیشت بۆکن پاشای بەبان و گوتی: (پاشا، ئەوان شایەران ئەوبەندوباوەیان هەموو بەپیوازی من هەڵا گرتوون ویەك چلیان لێ نەهێشتوونەوەو هەموویان هەڵقەندوون و بردوویانن. ئێستاش هاتووم یان دەبێ بۆم پێ‌بژێری، یان دەبێ بۆخۆتم بۆببژێری).

پاشای بەبانیش گوتی: (ئەی، پیرێژن، ئەتو حەیاو ناموسی خۆت بەعەلیەکوێری بردووە! خەریکی حەیاو ناموسێ منیشی پێ‌بەری!

پیرێژن گوتی: (پاشا، ئەمرت لەسەر سەری و لەسەر چاوی، بەڵام دەرکم گوتووی و بەری‌نادەم، یان دەبێ بەوانی بژێری، یان دەبێ بۆخۆتم بۆببژێری!).

پاشا گوتی: (ئەی پیرێژن، ئەمن بانگی عەلیەکوێری دەکەم، ئەگەر ئەتۆ سەلامت لەبیر بردەوەو نەت هێشت سەلامێ بکات، ئەوە ئەمن پیوازەکانت بۆ دەبژێرم! ئەگەر سەلامیشت لەبیر نەبردەوە، ئەوە هیچ هەقت نەمێنێ).

پیرێژن گوتی: (بەڵێ پاشا، زۆر چاکە).

پاشا بەدوای عەلیەکوێری بەردەشانیدا ناردو عەلیەکوێرهاتو گەیشتەجێ. عەلی هەناسەی هەڵکێشا ئەگەر سەلامێ بکات! پیرێژن بەندێکی بادایەو گوتی:

**عەلیەکوێری بەردەشانی**
**کوتی کوتی، نانی نانی**
**وەکو سەی هەر لەدەرکانی**
**دووکونم هەن لەنێو رانی**
**لەئاوی دەخۆی یا لەدانی**
**سوورگوڵ لەباغان جەننەتە**
**سووری لەبەر نازی دەتۆ!**

**عەلی:**

**ئەی پیرێژنێ هەلێك مەلێك**
**هەردووك کونانت دەکەم بەیەك**
**پاشای بەبان سەلام و عەلێك**
**سەلام و عەلێك ئەی کوێ شێران**
**هەردووك کونانی دەکەم وێران**
**دەیکەم بە تەنگی زەنوێران[10]**
**نۆ بارگینی لێ هەڵدێران.**

پیرێژن سەلامی پێ لەبیر عەلی ناچێتەوەو گرۆیەکەی دەدۆرێنی و زۆریش بەخویدا دەشکێتەوە، بەڵام نابەزێ و ئەو بەندەی بادەداتە عەلی:

**ئافەرم عەلی بۆگوتنت**
**سەلکە تووڕێك**
**سەلکی برواو پەلکی بمێنێ**
**هەر باڵێیداو بیشەکێنێ**
**خەڵکی وەپێکەنین بێنێ.**

**فەرهەنگ**

---

1 ـ تەوار: بازی مێ.
2 ـ بەبان: بابان.
3 ـ بەربەرۆچکە: (بەربەرۆژگە) بن دیوارو بەر هەتاو.
4 ـ ڕوویان لێنا: داوایان لێکرد.
5 ـ هەیدێکردن: هەیدێ ووشەیەکی ناشیرینە بۆ دەرکردنێ.
6 ـ ڕەنگە جینگەنە: ڕەنگە: (دۆن، ڕووخسار). جینگەنە: مۆن و تووڕە.
7 ـ ئەشکەنێ: ئەشکەنەو باوزە دووگوندی ڕۆژهەڵاتی قەلادزێ بوون.
8 ـ خەرتەل: داڵەکەر خۆرە.
9 ـ نوردووەنان: بریتییە لەچوارنانی پێچراوە.
10 ـ تەنگی زەنوێدان: تەنگە: دەربەند. زەنوێر: سەوزاییەکی بەئاوو پاراو. شارەزایانی چیاکانی مەرگەو پشدەریش بەو تەنگەیان نەزانی.

* ـ شەڕی پیرێژنی و عەلی بەردەشانی بەهەڵەو ناتەواوی لەبەیتێ (دۆلەبی)یەدا لەکتێبی (هەڵبژاردە لەشیعری فولکلوری کوردی) دای کاك فاروق حەفید بڵاوکراوەتەوە.

# کامیل سان ساین

## نوسینی ڕۆمان ڕۆلان

گۆڕینی له فەرەنسی‌یەوە ـ نجاة حمید أحمد

سان ساین خاوەنی مەزنی‌یەکی بێ هاوتـایە. کە دەبینین هێشتا هەر زیندووەو بۆتە یەکێك لە مۆسیقارە کلاسیکی‌یەکان! ناوی سان ساین کە ماوەیەکی زۆر بە نەناسراوی مایەوە، خۆی بە سەر ڕێزی هەموومانا چەسپاند، ئەمەش نەك تەنها لەبەر نەفس بەرزی‌و کەسایەتی‌یەوەی بێ‌وبەس، بەڵکوو بەهۆی هونەرەکەیشی‌یەوە.

هەرگیز ئەو هونەرمەندانەی کەمتر گرنگی بە جمهوور دەدەن، وایان لێ دێت چیتر خەمبارى‌ی بیری جمهوورو دەستەیەك هەڵنەگرن، هەر لە منالی‌یەوە سان ساین سیمای بێزاری‌ی پێوە دیاربوو بەرامبەر سەرکەوتن و ناوبانگی‌یەکانی. بەم بۆنەیەشەوە لە بارەی چەپڵە لێدانەوە دەنووسێت «ئێستاش لە بیرمە، لە کاتی منالی‌ی پڕ شەرممدا، کە گوێم لە هەرای چەپڵە دەبوو شتێکی زۆر سەیر بوو بە لامەوە هەروەك و شەرمەزاری بەرەوگیانم دەهات و کاری تێ دەکردم، بەڵام من شکم لە هاتنی دەکرد، زۆر جاریش بە سرکی‌یەوە خۆم بە سیمایەکی هێمن و ساردەوە لێ‌ی ڕزگار دەکرد!».

پاش ماوەیەکی زۆرو دووای ئەوەی سەرکەوتنی مل کەچ کردوو دووای چەند چەرخێکی پڕ لە چەرمەسەری، بەرەو ڕووی ڕەخنەیەکی نابینا بووەوە، ئەو بڕیارەی بە سەریاندا سەپاند ئەوە بوو «هەروەك تۆبە کارێکەو گوێ لە مۆسیقای بتهۆڤن دەگرێت! ئەم گوێ گرتنەش پێش ئەوەی لای ببێتە سزایەکی ترسناك». دووای ئەوەی چووە ئەکادیمیایەوەو دووای هینری هەشت و سیمفۆنیای ئۆرگدار، ئەو هەر خۆی بە دوو دەخستەوە لە ئافەرین وتەنانەت لە زەم کردنیش! هەروەك دەبینین چەند بە دڵ ڕەقی بڕیاری بە سەر سەرکەوتنەکانیا دەدا: ـ

**«تۆ چاوی درۆزن و قینی**
**دەست گوشینت دەناسی‌یەوە..**
**کاتێ دەمامکی هاوڕێتی چاو چنۆکی دەشاردەوە**

کاتێ دووا ڕۆژە ڕەنگە زەردەکانی
ئەو ڕۆژگارانەی دەستەی خەڵکی ساوا
بە هەمان کێش
مێژووی گاڵتە جاڕیو دانایی بێ دەرەتانیان دەکێشاو
تۆشیان دەخستە سەر تای هەمان تەرازووەوە».

بەڵام فارغۆنی تەمەن تێدەپەڕیو ناویانگی ی فراوانتر دەبووەوە، ئەویش هەرگیز نەرمی ی نیشان نەدا، لە دووا ساڵەکانی ژیانیا بۆ ڕۆژنامە نووسێکی ئەڵمانی دەنووسێ: -

«من زۆر کەم هەست بە پیاهەڵدان و پەلاماردان دەکەم، نەك بە هۆی هەستی زێدەوەری ی نرخی کە سایەتیمەوە کە ئەمە بەلامەوە بێ مێشکی یە، چونکە دانانی - چەند بەرهەمێك بە مەبەستی تەواوکردن و بەدی هێنانی پیشەیەکی سروشتیم من هەروەکوو دارسێوێك سێوبگرێ هەرگیز خۆم دوو دڵ و سەرلێ شێواو ناکەم بەو بیروڕایانەی کە ئەوان لە سەر باوەڕی مناپێکی دێنن».

ئەم سەربەستی یە لە هەموو سەردەمێکدا بێ هاوتایە، کە دەبینین ئەمڕۆ دەسەڵاتی بیر قۆرخ کراوە، بە تایبەتی لە فەرەنسادا کە هونەرمەند لە هەموو کاتێ زیاتر گۆشەگیرکراوە بە کۆمەڵەوە، سەربەستی ی هونەرمەند لە هەموو خاسیەتێکی تری بە نرخترە، چونکە هەر ئەم سەربەستی یەیە کە هەموو هونەرمەندێك دەگرێتە باوەش و دابینی ی هۆش و توانای تایبەتی ی دەکاتّ. بۆیە پێویستە پێش هەمووشتێ ئەم لایەنە بخەینە ژێر تیشکی پشکنینەوە.

دەلالەتی هونەری سان سایین دووسەرە، بە پێ ی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە فەرەنساو دەرەوەی فەرەنسا لە بارەی ئەم هونەرمەندەوە دەیکەن، چونکە لە مۆسیقای فەرەنسی دا شتێك دەنوێنێت تاك و بێ هاوتایە تاکو ئەمڕۆ مێشکی کلاسیکی ی، ڕۆشنبیری زانیارستانی کە دەبێ ناوی بنێن ڕۆشنبیری ی ئەڵمانی، هەرچەندە ئەم ڕۆشنبیری یەی سان سایین سوودی لە مۆسیقارە ئەڵمانی یەکان وەرگرتووە، ئەم دووبارەش بناغەی هەموو هونەرێکی نوێ یە.

مۆسیقای فەرەنسی ی چەرخی نۆزدەهەم لەگەڵ هونەرمەندە گیانی یەکان و ئاوازدانەرە داهێنەرەکان و لەگەڵ مامۆستا ووردبینەکانی شانۆدا لێك چوێنراوە. هەر بۆیە لە مۆسیقاری ڕاست و بەرهەمی پتەو هەژارە جگەلە دوویا سێ سەرکەوتنی تاك و تەرا، مامۆستاکانمان زۆر کەم سیمای داهێنەری خاوەن بەهرەیان پێوە دیارە کە بتوانن لە ڕێرەوی سەردەمی تێپەڕبووەوە مۆسیقا دابنێن، بە ڕای ئەمان مۆسیقا شێوەیەکی تایبەتی ی بیر نی یە، بەڵام جۆرە ڕازانەوەیەکی بیری ئەدەبی یەو بەس، جگە لەمەش پەروەردەی مۆسیقیمان زۆر ڕووکەشە، کە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم و، لە لایەن چەند پەیمان گایەکەوە ئەم پەروەردەیە درایە دەستەوەو بە شێوەیەکی ڕوونیش هەر بە شێوە بووەو بەس، چونکە ئەم پەروەردەیە لە هەموو وولاتا وەك یەك بڵاو نەبووەوە وەدەبینینیش کە منداڵ ئەوەندە هوگری ی مۆسیقای دەورووبەری ناکرێت، بە قەد ئەوەی چەند شێوەیەك هوگری هەستی ئەدەبی و دووانەدن دەکرێت.

نزیکەی هەموو خەڵکی فەرەنسا هەستی زگماکی یان هەیە بەرامبەر بە ڕستەی جووان، بەڵام هیچیان ناسیاوی یان نی یە لەگەڵ ئاوازوو (ئیقاعدا، تەنها ئەوانە نەبێ کە لەم لایەنەوە سەریان دەردەچێت. هەر لێرەدایە ناتەواوی و کەم و کوڕی ی ئاسایی مۆسیقای ئێمە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا مۆسیقای کلاسیکیمان وەك هونەرێکی فراوان و دەوڵەمەند مایەوە، وەوەك مۆسیقای ئەڵمانی لێ نەهات کە پڕ بێت لە بیری گەلێك!

بۆ ئەوەی مۆسیقا ببێ بە شتێکی کە پێویستە بە چەند بارێکی بێ هاوتایا ببرێت ویارمەتی ی بدرێت، وەك ویەك گرتنی ئەو بارانەی کەسان ساینیان خستەوە، خێزانێك بە مەیل و حەزەوە مۆسیقی بوون و خۆیان بۆ پەروەردەی مۆسیقی تەرخان کردبوو، سان سایین تەمەنی پێنج ساڵان بووو بە دابەش کردنی مۆسیقای ئۆرکێترایی «دۆن جووان»ی مۆزارت خرایە ژێر چێژموەو پەروەردەکرا کە دەڵێت: -

دەساڵ بە پەرپووتی و ڕووتی، بەڕەنگی زەردەوە وەك ئالتوون بەڵام بە باوەڕو پاکی و بەگیانی پڕ لە تاسەی خۆشی.

کەچی لە ئاهەنگێکی میللی دا سان سایین لەگەڵ بتهۆڤن و مۆزارت دەکەوێتە شەرە چوقەوە، مامۆستای لاو تەمەنی سیازدەساڵان بووو یەکەمین سیمفۆنی یەکانی دەنووسی یەوەو دەچێتە ناخی زانیاری باخەوە، جگە لە هاندڵیش، وە بە توواناوە بەرهەمێکی نووسی یەوە بۆ (ڤیردی)و (شۆمان)و (وانێ). لەراستیدا بەرهەمێکی زۆری مۆسیقی ی بە هەموو جۆرە شێوازێك نووسی یەوە، بە شێوازی ئیغریقی وچەرخی حەڤدەهەم وچەرخی هەژدەهەم، وە لە هەموو جورێکی مۆسیقادا بەرهەمی هەیە، بەشێوەی مێس و Messes» ئۆپێراو، ئۆپێرای کۆمیدی و کانتان و «Cantates» و سیمفۆنیاو، سیمفۆنیای ئۆرگۆندارو پیانۆو، مۆسیقای ژوور، Musique» de chambre هەروەها بە دانایەکی بلاوکەرەوەی بەرهەمی گلۆك و رامۆ دادەنرێت. لە دوواییدا نەك تەنها زانی ی بیبێتە هونەرمەند، بەڵکوو توانی ی هونەرەکەی هۆداریش بکاو دەسەلاتیشی بە سەریا بسەپێنێ، وە سیمایەکی هونەری وای هەبوو کە بێ هاوتایە لای ئێمە، بەڵام دەبینین لە ئەڵمانیادا چاکتر لێ ی گەیشتن وەك لای ئێمە، لە ئەڵمانیادا سان سایین زلترین نازناوی مۆسیقی بوو، هەر لە (بێرلیۆزەوە) تاکوو دەرکەوتنی پەیمانگای مۆسیقی ی (سیزارفرانك)ەو سیزار خۆیشی هێشتا ئەوەندە ناوبانگی ی نەبوو لەوکاتە. ئەوی راستی بێ لەوکاتەشدا سان سایین بەرزترین خاسیەتی هورنەرمەندانی فەرەنسای دەنواندوو لەپێش هەموویانەوە بووو لە هەموویان بیری کۆکترو پوخت تربوو، وە هەروەك. ئەوهونەرمەندە رۆشنبیرە لەبەرچاوبوو، کە تۆزێك دڵی کەسەربێت بەوناوبانگی وزانیاری یەی کە هەیبوو، چونکە ئەو دەیەوێت سەربەست بێت لە هەموو خۆبایی بوونێك و نایەوێ پێ یەوە دەرکەوێت. ئەو لەخۆبایی بوونەی کە برینێك بووبەگیانی هونەری مۆسیقی ی ئەڵمانی یەوەو هیچیان نەیان توانی لێ ی رزگاربن. من مەبەستم (براهمس)نی یە کە لای ئەوئەم لەخۆبایی بوونە بە توندی رەت کرایەوە، بەڵکوو مەبەستم بەرزترین وچاکترین زاناکانیانە وەك (شۆمان)و، بەهێزتریشیان کە (باخە). لەم بارەیەوە یەکێك لە رەخنەگرەکان دەڵێت: ـ

«ئەم هونەرە رازاوەیە، هەر کە گوێ ی لێ دەگریت بێزار دەبیت، وەك ئەوەی لەناو ساڵۆنێکی پر حەشمەتی شارێکی بچووکی پرۆڤانس بیت و بەرەو مردن هەناسەبرکێت بێ».

«سان سایین هەرگیز لەخۆی بایی نەبوو، چونکە وەك منداڵێکی بێ تاوان ئەم شتەی نەدەزانی، وە ئەوەندە زاناش بوو کە خۆی لێ دوور بخاتەوە». لێرەشداسان سایین هەروەك نووسەرێکی چەرخی هەژدەهەم دێتەوە یادم، مەبەستیشم دەستەی «جان جاك رۆسۆ»نی یە، بەڵکوو مەبەستم ڤۆلتێرە ـ سان سایین خاوەنی بیرێکی گەش وخاوەنی توانایەکی ئاواز دانانی پوختەو خاوەنی مێشکێکی نموونەیی یە کە مۆسیقاکانی بەجۆرێك دادەنا «نەك تەنها بەرزبوون، بەڵکوو لە خێزانێکی مۆسیقاوان و بنەماڵەیەکی مۆسیقاوان بەو بەرزی یە پەروەردەی مۆسیقی ی کرابوو».

لە هەمان کاتیشدا هەستی بێ لەکەوهێمنی هەیە «بەهرەکەی کە لە ناخی هێمنی یەو، مێشکیشی لە باوەشی دەسەلاتی داهێناندا، حوکمێکن هەمیشە رابەری یان دەکرد، جگە لە هەڵچوونە پەشێوەکانی». هەر بۆیە هەستی ووردوو توندی سان سایین دوژمنی هەموو رەشبینی یەکی بیروو سۆفیزمی بوو، هەر ئەمەش پاڵی پێوەنا کتێبێك بنووسێتەوە بەناوی «گیروگرفتەکانی ئاڵۆزی»، وە لەم کتێبەدا سان سایین داوا لە لاوان دەکات کە پارێزگاری لە «پاکی ورەونەقی جیهانی هەرەشە لێ کراو بکەن» دژ ی تەم ومژ ی باکووروو، دژ ی خوایە ئیسکەندەناڤی کان و دژ ی سروشتی پەرستگەیی هیندوو، موعجیزەکانی ئایینی کاسۆلیك و رارەوی ناخەکی ی ئاڵۆز، بۆیە چەرخی هەژدەهەم بەگشتی لە هەموو شتێك زیاتر پێویستی ی بە سەربەستی بوو، دەتوانین بڵێین سەربەستی تاکە هەستی سان سایین بووهەروەك دەڵێت «پربەدڵ حەز لە سەربەستی دەکەم» ئەم بروایەشی بە راستگۆیی وەدەرخست لە نێو بیروورا کانی دەربارەی هونەر، کە لەم بیر و رایانەیدا نەك تەنها توانی بە سەرکەشی لەبەردەم «وانەردا» بوەستی بەڵکوو بێ پەروا لاوازی یەکانی مۆزارت و

«گلوکی» دەست نیشان کرد، لەگەڵ هەڵەکانی «ویبەر» و «بێرلیۆز». ڕایەکانی «گونود»یشی بەرپەرچ دایەوەو دەنووسێت «ئاوازەکانی بەرهەمی هاندڵ و باخ ئەمرۆ ئەندێشەن»، وە ئەو کەسەش کە دەیەوێت ئەم هونەرە زیندوو بکاتەوە وەك ئەو کەسە وایە (دەیەوێت لە نێو کۆشکێکدا نیشتەجێ بێت کە چەندەها چەرخ چۆڵ کرابێت)! بەمەشەوە ڕانەوەستاو دەستی کردە ڕەخنەگری و بەرپەرچ دانەوە دژ بە خۆی، تیکەی چێژی سەربەستی وای لێ کردبوو، کە لە هەر نووسینێکیدا، بەرهەمەکەی جێ نزرگەی چەندەها هەڵسەنگاندنی جیاوازجیاوازی چەند چەرخێکی جیاوازبێت، وە داوای ئەوەی دەکرد کە بیر مافی ئەوەی هەبێت گۆران کاری بخاتە کایەوە، لە هەمان کاتیشدا سەر دانوواندنیش لەبەردەم ڕاستی یەکی داسەپاو، هەروەك بزربوونێکی پاك و بێ گەرد دەبێ بەشێوەیەکی سەربەست لێی دڵنیا بین، ئەم هەستەش لە دەرەوەی هونەردا دەردەکەوێت ـ لە ڕەوشتدا ـ دەبینین سان سایین شیعر دەنێرێت بۆ هاوڕێیەکی و داوای لێ دەکات کە ببەسترێتەوە بە کەوتنە دووای سروشتی خاوێنەوە، وە هەرگیز ڕێی ئەوە نەدات، کە بەپێی داگرتن و کەللەڕەقی یەکی زێدەوەرەوە زنجیربەست ببێت. لەمیانی میتافیزیکیشەوە بە تواناو چاو نەترس یەکی زۆر مەندەوە بریاروو ڕایەکانی دەربارەی دڵسۆزیو، ئینجیل و ئایین تۆمار دەکات. وە هەر لە نێو ئەم سروشتەدا لە بناغەوپەیڕەوی ڕەوشت و کۆمەڵ دەگەڕێت، ئەم مێشکە سەربەستەو مرۆڤایەتی یەی سان سایین بەرەو ناخی هەستی یەك گرتنی گشتی ی مرۆڤا شۆڕ دەبێتەوە! بۆیە بەبتهۆڤن دەڵێت «مەزنترین وراستگۆترین. هونەرمەندە، چونکە گۆرانی ی برایەتی ی گشتی ی دەوتەوە». ئەم زیرەکی یە سەرکەشەی سان سایین بێ هاوتایە، کە چەندەها کتێبی دەربارەی مۆسیقاو شانۆو فەلسەفەو وێنەکێشانی کۆن و لێکۆڵینەوەی زانستی و چەندەها بەرگی شیعرو تەنانەت لەبارەی کۆمێدیاشەوە نووس یەوەو هیچ جۆرە هونەرێك نەما خۆی پیایا شۆڕنەکاتەوە، من ناڵێم ئەمانەی هەموو بە شێوەیەکی هونەری و زیرەکانەوە کردووەو بەس، بەڵکوو دەڵێم بە هەستی خاوێن و ساکاروپتەوی یەوە دیار دەیەکە زۆر کەم لەلای هونەرمەندە مۆسیقی یەکانی ئەمڕۆیا دەبیترێت. ئەو دوو ئامانجەی کە سان سایین دەیخاتە نێو بەرهەمەکانی یەوەو هاوتایی و یەکسانی یان دەداتێ «دووری کەوتنەوەیە لە هەموو زێدەوەری یەك، ڕەخسکانی تەندروستی ی مێشکە». بێ گومان ئەم قسانە مەبەستی نەبتهۆڤنەو نەوانێیە، چونکە ئەوان باسی خۆیان دەکەن بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات، بەڵام ئەوەی سان سایین جیا دەکاتەوە لەمانەو خاسیەتی خۆی دەداتێ ئەوەیە، هیچ هەستێك نەیتوانی زاڵ بێت بەسەریا، هیچ شتێك نەیتوانی هۆشی تێك بدات وەك و «گونود» دەڵێت «ڕارەوی نی یەو سەربەهیچ دەستەیەك نی یە». بە هەمان چۆرنەك لە ڕارەوو کۆمەڵی ئێمە، هەرچەندە ئەو ترسی نی یە داوای گۆڕینیان بکات، ئەو سەربەستە لەوانەیە زۆرتریش سەربەست بێت بە ڕووانیتە مۆسیقی یە ڕوونەی کە هەیەتی.

لێرەدا وا دەردەکەوێ کەیوانەیەك هەیە لەنێوان کەسایەتی ی سان سایین و مەندلسن «Mendelssohn» هەر لەلای ئەم دووەشە، هەمان نەرمی ی هۆشەکی و هەمان هاوتایی هەیە لەنێو ڕەگەزە گۆڕاوەکانیانا، کە هەردوکیان هەمان ڕەگەز دەخەنە نێو بەرهەمەکانیانەوە! بەڵام نەك وەك و یەك چونکە چەرخ و نیشتیمان و شوێنگەکانیان وەك و یەك نین. بەڵام لەگەڵ ئەمەشا جیاوازی هەیە لە نێوانی کەسایەتی یاندا. مەندلسن زۆر ساکارو ڕێك و پێك و ئایین پەروەربوو، بەڵام سان سایین زۆرتر لەوی هۆگری هونەری هەیەو زۆرتر کاری تێ دەکاو چێژدارتریشە لەم میانەدا! بۆیە ئەم دوو هونەرمەندە نەك بەهۆی زانیاری ی قووڵیانەوە ئاشنایی لەبیرماندا پەیدا دەکەن، بەڵکوو بەهۆی ناسیاوی ی پاك و بێ گەردیانەوەو، بەهۆی چێژی بێ لەکەو دانایی بە تەباوکۆکیانەوە، وا دەکەن ڕوویەکی کلاسیکی ی نوێ بدەنە هەموو ئەو بەرهەمانەی پێش کەش دەکەن.

لەبارەی ئەو هۆیە پاڵ پێوەنەرە راستەوخۆیی یانەوەی کە بە شانی سان ساینیەوە بوون و ئازارەکانی دەچێشت، ئەوەندە زۆربوون و ئەوەندە گران بوون، وە ئازایەتی یەکی تەواوی پێویست بوو تاکو خۆی لە یەخەیان بکێشێتەوە، هەروەك زۆر بە روونیش دیارە کە خۆیان سەپاندە سەر بیر و مێشکی یەوە، وەگەرچی هەندێ جار دەبینین بەهرە گەورەکەی سان ساێین وەك وگێرانی دەورێك، پاڵی پێوە دەنێت بە شێوازی وانێ و بێرلیۆز و هاندڵ و رامۆ بنووسێتەوە، ئەمە هەرگیز گێرانەوەیەکی راست گۆویاری یەکی مۆسیقی ی پڕ بەهرەیەتی نەك لەبەر نەزانی یەتی.

وە لێرەدا سان ساێین بیر بەکاردەهێنێت لەجیاتی دەسەڵات، هەرگیز پەشیمانیش نی یە لەم بەکارهێنانە، هەرچەندە ئێمەش بەلای خۆمانەوە هەوڵ دەدەین ئەمە روون بکەینەوە، دەڵێن بیری مۆسیقی ی سان ساێین سەرجەمی بیری مۆسیقارە کلاسیکی یە گەورەکانی کۆتایی چەرخی هەژدەهەمە، بۆیە دەبینین ئەو شتانەی.

لەبارەی بتهۆڤن و هایدن و مۆزارتەوە نووسیوەیەتی یەوە زۆر تربوون وەك لەبارەی باخەوە نووسی یەوە، بەلام سەرلێ شێوانی شۆمان کاری کردە سەری، لەگەڵ ئەمەشدا بێ گرنگی و بێ بایەخی ی کەسایەتی نیشان نەدا، نەبەرامبەر «گونودو نەوانێ و نەلیزێ». بەلام ئەم پاڵ پێوە نەرانەی سان ساێین وا دەردەکەوێت کە هەمان پاڵ پێوەنەرە ـ کانی (بێرلیۆز)ی هاورێ و مامۆستای بن، سان ساێین بەدەستی خۆی نەبوو دەبووایە (لیزێ)ی خۆش بویستایە، لەبەر ئەو هەموو سەربەستی یەی لە گیانیا نیشتەجێ بووبوون.

لەبەر هەموو ئەو دژایەتی یانەی لەگیانیا بوو دژی لاسایی کردنەوەو خۆپیاهەڵدان، دژی رۆتینی یەتی مۆسیقای ئەڵمانی، بەڵێ خۆشی دەویست بەهۆی کاردانەوەی توندی لیزێ دژی دانیشگای مۆسیقی ی (براهمس) «Brahms» کە زۆر بە خۆیەوە دەنازی، لەبەر ئەمانە سان ساێین دڵ گەرمی و خۆشەویستی یەکی دڵسۆزانەی هەبوو بەرامبەر بەرهەمەکانی (لیزێ)، لیزێش سان ساێین بە یەکێك لە پێشترین پاڵەوانە خوێن گەرمەکانی ئەم مۆسیقا نوێ یە دادەناو رای وابوو کە پێشەوای ئەم مۆسیقا پرۆگرام دارەیە، سان ساێنیش لەشوێنێکدا دەڵێت (لیزێ یەکێکە لە گەورەترین مۆسیقارەکانی ئەم چەرخەمان، چونکە ئەوەی لە دەست ئەو هات، نە (ویبەرو، نە مەندلسن و، نەشۆبێرت ونەشۆمان، پێیان بەدی نەهێنرا، وەلیزێ داهێنەری شیعری سیمفۆنی دادەنرێت «Poeme Symphonique» وە داهێنەری مۆسیقای وەسایقی یە «Musique instrumental» داواکەری مۆسیقای سەربەستە». ئەم رووانینە راوبیری رۆژانەنین کە سان ساێین دەریان دەبڕێت لەکاتی کارتێ کردن و هەڵچووندا، ئەمانە بیری هەموو ژیانین، بەدرێژایی ژیانیشی دڵسۆزانە مایەوە لە رۆشنبیری ی بەرامبەر لیزێ، هەر لە ساڵی 1858 وە تا ساڵی 1885 کە چەند مانگێك دووای ئەم مێژووە لیزێ دەمرێت. بەم یادەشەوە سان ساێین سیمفۆنیایەکی ئۆرگۆنداری پێش کەش کرد، کە بە پێشەوای بەرهەمەکانی دادەنرێت لەم بارەیەوە دەڵێت: ـ

«ئەوان بە هەڵەیا نەچوون، کە گاڵتە بەو شتە بکەن کە ناویان نابوو لاوازی ی سان ساێین بەرامبەر بەرهەمەکانی لیزێ. بەلام هەرچەندە هەستی خۆشەویستی و سۆز و ناسیاوی ی توانی یان ئیلهام بخاتە دڵمەوە وەك ئاوێزەیەك ناوەندێ دروست بکەن لەنێوان رووانینەکانم و وێنەکەی لیزێ، دەڵێم من هیچ شتێکی وا لەمەیا نابینم کە جێ ی داخێکی قووڵ بێت، بەلام من بەهیچ جۆرێك قەرزارباری ئەو نیم، وە بەهیچ بارێك وە بەهیچ بارێك لەژێر کاریگەری ی سرنجە کەسایەتی یەکانیدا نەبوومە، وە هێشتا نە ئەوم بینیبوو نە لەگەڵی دووابووم، یەکەمین بەرهەمی شیعرە سیمفۆنی یەکانیم خوێندەوەو کەوتمە ژێر کاریگەری یەوەی وە دووای ماوەیەکی زۆر درەنگ ئەم کاریگەری یە رێ ی نیشانم دا کە بەرهەمەکانی «سەمای جەنازە» «Danse MacabreM» و «Rouet d'Ompale» و هەندێ بەرهەمی تریش بنووسمەوە کە هەمان سروشتیان هەبووو لەگەڵیاندا یەکمان گرتەوە، وە لەم بارەشدا من دڵنیام کە بریارەکانم بەهیچ جۆرە پایەپێدانیکی سەیرەوە

نەشێوێنراون، هەر لەم بارەیەشەوە لێپرسیاوی ی تەواویان دەگرمە ئەستۆی خۆم».

ئەم گوڕو بەپەرۆش یەی بەشێوەیەکی وا دێتە بەرچاوم کە بەشێك لە بەرهەمەکانی ڕوون بکاتەوە، ئەم پەرۆش یەش نەك تەنها لەنێو شیعرە سیمفۆنی یەکانیدا چەسپێزاوە کە چاکترین بەرهەمەکانیەتی، بەڵکو لە هەمووڵایەکی بەرهەمەکانیدا هەستی پێ دەکرێت، هەر لەدووا ئۆرکستراکانیەوە تاکوو بەرهەمی فانتازیو شیعرە داستانی یەکانی، کە مەیلی وێنەکێشان و گێڕانەوەی ڕۆمانانەی تێدا بە ڕوونی دیارە.

سان سایین دەڵێت. مۆسیقا دەبێ خۆی سرنجی خۆی ڕابکێشێت، بەڵام ڕاستی ی ئەم بارە زۆر لەوە گەورەترە «کاتێ چێژ ی بێ گەرد دێت و خۆی دەخاتە سەر خەیاڵی بێسنوورەوە، بێ ئەوەی دوودڵی ی دەنگێکی دیاریکراوی تێ کەوێت، بەبیرەوە دەبەسترێتەوەو بەند دەبێت، هەر لێرەوەیە هەموو تواناو دەسەڵاتی گیان دەکەوێتە سەما لەنێو ئامانجی مۆسیقاو مەبەستیدا، ئەوەش بۆ هونەر دەمێنێتەوە لەم بارەیا. تەنها جوانی یەکی بەرزنی یە، بەڵکوو کێڵگەیەکی زۆر بەرفراوانە کە دەسەڵاتی خۆی تێدا دەخاتە کار، بەڵکوو گەورەترین جۆراو جۆرکردنی شێوەیەو گەورەترین سەربەستی یە».

بەم جۆرە سان سایین وا دەردەکەوێت هاوبەشی ی بزووتنەوەی سیمفۆنیا دانەرەکانی ئەڵمانیای کردووە، بەنیازی ئەوەی هەموو جۆرە هونەرێکی تربخەنە نێو مۆسیقایەکی بێ گە ردەوە، وەك وێنەکێشان و هۆنراوەو فەلسەفەو، ڕۆمان و دراماو بەڵکووژ یان بەگشتی. بەڵام جیاوازی یەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەوو مۆسیقارە ئەڵمانی یەکان، ئەم جیاوازی یەی نێوانیشیان تەنها لە شێوازدا نی یە، ئەم جیاوازی یانە دوو ڕەگ و دووجیهانی پێچەوانەن کە بەرەو ڕووی شەپۆلی خنکێنەری «ریچارد ستروس»دا، بەڕاست و چەپا دەکشێتە نێو قوڕوژ یلەموعەبقەری یەتەوە بۆیە هونەری لاتینی ی سان سایین بەگاڵتەجاڕیو بێ پەروای یەوە ڕادەوەستێت. چێژ ی سان سایین بۆزانین بۆرازی بوون و ساکاری و دەوڵەمەندی ی، تیژ بینی ی هەموو ئەمانە، لەنێو درزی بچووك بچووکا لەپانایی گیانا بڵاودەبنەوە».

بەم جۆرەش چێژێك پەیدا دەکەن بەهۆی زمانی بیرێکی تازەبینن و ڕوون و بێ پەرواوە، ئەم نووسینە تووندوو بە پێزە هەست و سرنج ڕادەکێشێ و هەروەك و خاسیەتێکی بەرزی هونەری یە.

لەنێو هونەری مۆسیقی ی ئەمرۆی پەشۆکاو، ئەم جۆرە مۆسیقایەی سان سایین، بەهۆی هێمنی وئیقاعی پڕئاوازوونەرم هەست پێکراوو، بێ گەردی یەوە هەروەك کریستال، وە بەهۆی شۆڕبوونەوەی شێوازی یەوە بەبێ سینگە کوتێ کاریگەری یەکی چاکی ئەم مۆسیقایەیە، هەتاوەکوو هەندێ جاریش هەست دەکەین ساردی و هێمنی ی مۆسیقای کلاسیکیش، بەهۆی کاردانەوەی زگماکی یەوەی، بە تەباتروکۆکتر دەردەکەوێت لە هونەری ئەمرۆ، کە گەڕانەوەی هونەریش بۆ (مەندلسن تاکوو سپۆتسینی و دانیشگای مۆسیقی ی گلۆك، وەك و بینینی دیمەنێك وایە کە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر بینیومانەو بەدڵمان بووەو خۆشمان ویستووە، بەڵام هەرگیز ناتوانین خاڵەکانی لێك چوونیان دەربخەین بەهۆی هیچ لایەکی یادکردنەوەی نابیناوە، ئەوەش دەمێنێتەوە ئەوەیە تەنها ئەم مۆسیقایەیە کە مامۆستا کلاسیکی یەکانی لەیادگارماندا پاراستووە، سان سایینیش نەك تەنها بەیادگار بەڵکوو بەمێشك و گیانەوە بەوان دەچێت، ئەمەش تا ڕادەیەك نهێنی ی کەسایەتی و پایەی بەرزی یەتی لای ئێمە، چونکە هەر ئەوە گەر هیچ نەبێ کۆزێك لە ڕووناکی و دڵ گەش و شیرینی ی ڕابوردوومان بۆ دێنێتەوە لەنێو گومانی هونەری ئەمرۆماندا، بۆیە ئەم لالێ کردنەوەیە لە ڕابوردوو هەروەك پارچەی جیهانێکی وون بووە وایە.

هەندێ جار وا دەردەکەوێت کە نەزانێت چی بکات لە سەربەستی یەکەی، یەکێك لەم بارەیەوە دەڵێت «لام وایە سان سایین پێویستی ی بە هەندێ دەست لێدانی شەیتانی هەیە».

شێوەی کەسایەتی و تایبەتی ی، فیزیونومی ڕەوشتی، بەلای منەوە وا دەردەکەوێت لەنێو درێژ بوونەوەیەکی خەماوی دابێت، کەسایەتی ی وەك کانی یەك، لەناو هەستی پڕ ژان و ئێشی نەبوونا کەوای لێ دەکرد هەست بە بوونی خۆی نەکات، لەگەڵ تایەکیماندووکەری توندی نەخۆشیداریشدا، دەتەقی یەوەو تیایدا لەرزە تامی گاڵتەی خەیالاوی و دڵخۆشی ی پڕ دەمار گیران و ئارەزووی کۆمێدی ی ڕەخنەگرانەو پڕ لەگاڵتەجاڕی، هەموو ئەمانە لە دووای ئەو هەستانەوە دەردەچوونە دەرەوەو پەیدادەبوون، ئەم هەستانەشی بێگومان شێوەیەکی گوماناوی و بەلکوو ترس و لەرزیشی لا پەیدادەکرد، هەر لەبەر ئەم هەستانەشە کە سەری خۆی هەڵدەگرێ، بەپانایی جیهانا ڕابکات و مۆسیقاکانی چیرۆك و داستانی چەندەها نەتەوەی تیادا ڕەنگ بداتەوەو وای لێ دەکات، بە نێو شیعری ئەفسانەیی چەرخەکانی ناوەڕاست و، گۆرانی یەکانی ڕۆژهەلات و خزمەتکاری جەزائیری یەکانی سەردەمی کۆن و گۆرانی ی دەریاگەرەکانی قورتوبەو، چیرۆکی خۆشەویستی ی ڕووسی یا عەرەبی و یادگاری یەکانی ئیتالی و سۆزەکانی ئەفریقی و جەژنە میللی یەکانی میسر و هەموو ئەمانە بەشێوەی مۆسیقا بنووسێتەوە، لەوەش زیاتر ئەم هەستانەی وایان لێ کرد کە چەرخ بە چەرخ بگەڕێ لەگەڵ تراجیدیا ئیغریقی یەکانی و ئاوازی سەمای چەرخی شازدەو حەڤدەوا، پێشەکی یە مۆسیقی یەکانی و «Prelude» زنجیرە ئاوازەکانی «Fugue» چەرخی هەژدەهەم و مۆسیقای وولاتە بێگانەکان و مۆسیقا کۆنەکانی چەندەها چەرخی پێش خۆیەوە بگەڕێت کە چەندەها سەردەم و ناوچە دەنوێنێت و مێشکی پەڕیوەی پەنایان دەباتەبەر. بەلام لە هەموو ئەم کارانەیدا بەزیرەکی دەناسرێتەوە، وە بەشێوەکی پڕ لە دوودڵی بەرەو ئارەزووەکانی دەڕوات، کاتێکیش دەیەوێت بچێتە نێو هەستی ئەوگەلەی دەیەوێ تیایا شۆڕبێتەوە، ئنجا لەسەر خۆو بەشێنەیی خۆی دەداتە دەستی مەیل و سرنجەکانیەوەو، هەموو ئەوەشی دەبینێ بەرەو خۆی ڕایدەکێشێ و دەیکات بە فەرەنسی.

**پەراوێزەکانی ئەم نووسینە: -**

**1 ـ کامیل سان ساین: مۆسیقارێکی بەرزی پیانۆو ئۆرگۆنە «ئۆرغۆن» لە ساڵی 1835 لە پاریس لەدایك بووە، خاوەنی بەرهەمێکی زۆری لیریکی یانەیە وەك «شەمشوون و دەلیلە» لە ساڵی 1877 نووسیویەتی یەوە، وەبە سمفۆنیای ئۆرگدار و شیعری سیمفۆنی یەوە «سەمای جەنازە»ی نووسی یەوە، چەندەها بەرهەمی تری هەیەو لە چەندەها جۆری مۆسیقی لەساڵی 1921 مردووە.**

2 ـ Messes» مێس، لە ئایینا قوربانی ی لاشەو خوێنی مەسیحە، جۆرە ئارق و سەموونێك پێش کەش دەکرێت و ئاهەنگی بەدووایا دەبێت، بۆیە مێسیش ئیلهامی ئەم ئاهەنگەیەو چەند پارچە مۆسیقایەکی لاوانەوەی کەشەئایینی یەکانی کاسۆلیکە کە لەگەڵ قسەو لاوانەوەی قەشەکانا دەووترێتەوە.

3 ـ Cantates» کانتات، چەند دیمەنێکی گۆرانی یە، لەگەڵ یەك یا چەند کەسێك دەووترێتەوە، بەهاوڵی ی مۆسیقا لەهەر دیمەنێکدا.

4 ـ Voix» واتە دەنگ یەکێکە لە جۆرەکانی ئۆرگۆن، مۆسیقایەکە بەفوو لێدەدرێت.

5 ـ Musique de Chambre» واتە مۆسیقای ژوور، لەکۆنا مۆسیقایەکی دەنگی بوو لە ناو ژووری میرەکانا لێ دەدرا، ئەمرۆش بە مۆسیقایەك دەووترێت کە بۆ ژمارەیەك لە مۆسیقارەکان لێ دەرێت.

6 ـ بێرتۆلدمەندلسن ـ مۆسیقارێکی بەناوبانگی ئەڵمانی یە، لە هامبۆرگ لە ساڵی 1809 لەدایك بووە، جووانترین بەرهەمەکانی پێك دێت لە لاوکی ئایینی و سیمفۆنیا، گرنگترین بەرهەمەکانیشی «ئۆدیب و ئەنتیگۆن» و «خەوی شەوێکی هاوین»ە لە ساڵی 1847 مردووە.

ئەم نووسینە لە کتێبی ـ LES Musiciens DE Aujourd'hui»
Roman Roland ، وەرگیراوە.

# لە بارەی کاکڵەی کەلە پووری دۆستۆیڤسکی یەوە

نووسینی ئەکادیمی سۆڤێتی (غ - بوسبیلوف)
وەرگێرانی بۆ عەرەبی: د - جلیل کمال الدین
بۆکوردی: لەتیف هەڵمەت
گۆڤاری الاقلام/ ژمارە - 11 -ساڵی 1980

(1)

ئەوا سەدو پەنجا ساڵ بەسەر لەدایکبوونی (فیۆدۆر میخایلۆڤچ دوستۆیفسکی)دا تێپەڕیو کەچی هێشتا بەرهەمەکانی هەر زیندوون و بە شاکارە وێژەیی یە هەرە بەرزەکانی رووسیی و جیهانی لەقەڵەم دەدرێن. ئەوا نەوەد ساڵیش بەسەر کۆچی دوایی دۆستۆیفسکی دا تێدەپەڕێو کەچی هێشتا ناوی لەناواندایەو پەردەی لەبیرچوونەوەی پیادا نەدراوەتەوە.. و بەردەوام باس دەکرێ و لەسەری دەنووسرێ و هەڵدەسەنگێنرێ و هەتا ئێستا سەدان کتێب و هەزاران وتار بەگەلێ زمان دەربارەی داهێنانە وێژەیی یەکانی و کەسایەتی خۆی و ژیانی نووسراون و بلاوکراونەتەوە. لە پەستاو رۆژ لەدوای رۆژ یش مشت ومڕی ئەدەبی دەربارەی دۆستۆیفسکی هەرگەرم و گورتر دەبێ و هەرجوونێك بەشێوەیەك تێیدەگەن و هەڵیدەسەنگێنن و لە بەهرەکانی دەکۆڵنەوە ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بەرهەم نووسینەکانی دۆستۆیفسکی ناوەڕۆکێکی یەگجار دەوڵەمەندو چڕو قووڵ و جۆربەجۆرو لەهەمان کاتدا ناکۆکی هەیە.

(2)

نووسینەکانی دۆستۆیڤسکی یەکێکە لە نووسینە هەرە تایبەتی و بەرزەکانی جیهان و (سالتیکوف - شیدرین) یەکەم کە سێك بووە کە هەستی بەم بەرزیو گرنگی یەو بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی کردووە.. ئەویش ئەوەبوو دوای دەرچوونی رۆمانی (گێلۆکە)ی دستۆیفسکی.. (سالتکوف - شیدرین) دەربارەی دستۆیفسکی نووسی:

(ئەم نووسەرە لە ولاتەکەماندا بێ هاوتایەو نووسینەکانی قووڵن و چارەسەری گێچەڵە رەوشتی یەکان دەکات و ئەو تەنها ئەو لایەنانە وەرناگرێ کە کۆمەڵگای هاوچەرخمان دەجووڵێنێ بەڵکو لەوە زیاتر بەناخی شتەکاندا دەروات و جیهانە شاراوەو هەستە پشێنە دوورەکانی ئاواتی مرۆڤ و خواستەکانی دەخاتە بەردەست).

ئەم قسانە ئەگەرچی دەربارەی بەرهەمێکی نووسەر وتراون بەلام لەهەمان کاتدا بەسەر هەموو بەرهەمەکانی تریدا دەسەپێ.. لە نیوەی یەکەمی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دۆستۆیفسکی هەر لەخۆیەوەو خواوراسان تێگەیشتنێکی تایبەتی دەربارەی جیهان گەلاڵە کردو پێ بەپێی ئەو تێگەیشتنە تایبەتی یە خۆی تەرخان کرد بۆدووان ودەربرین دەربارەی ئەو خەمانەی کە کۆمەڵگای رووسی ئەوسەردەمەی تیادەکولا کە ئەویش کۆمەڵگای دوای چارەسەرکردن و کۆتایی هاتنی کۆیلایەتی بوو. ئالەو رێیەشدا گەلێ نووسەرو رەخنەگری ریالیستی خەباتیان کردو چەوسێنرانەوە:

دۆستۆیفسکی هەتا دواهەناسەی نووسەرێك بوو پەیوندی بە کۆمەڵەکەیەوە زۆر بەتین بوو و بابەت و ناوەڕۆکەکانی لەگێرەوکێشەکانی ئەوانەوە هەڵدەهێنجا، کوێرەوەری جەماوەرو چەرمەسەری هەژارانی لادێ و قوربەسەری ئەو کاربەدەستە بچووك و رۆشنبیرانەی کە بە هەموو جۆرێك لە لایەن چینە کۆمەلایەتی یە دەسەلاتدارەکانەوە ئازار دەدران و دەچەوسانەوە... هەروەها دەسپیسی و کرداری نارەوای ئەو چینە دەسەلاتدارە رەوشت رووخاوانە، هەمووی لە دڵی دستۆیفسکی دا بوو بوونە گرێکوێرەو رارایی و سامناکی و پەژارەو خەمی قورسی.

هەمــوو رۆمــانــەکــانی دۆستـۆیفسکی لە کاتی خۆیدا رەنگـدانـەوەی ئەوبـارەی رووسیـای ئەو سەردەمـەبـوون، جا هەروەکـو سالتیکـوف شیـدرین وتی (بەراستی دۆستۆیفسکی بەوردی وێنـەی خەمـە کۆمـەڵایـەتی یـەکـانی گرتـوەو بەناخی جیهــانـە شاراوەکـان و ئەو هەست و سۆزە پێشینـانـەدا چۆتـە خوارێ کە بە خواست و ئاواتە دوورەکانی مرۆڤەوە پەیوەستن. سەرنجی دۆستـۆیفسکی دەربـارەی جیهـان جگـە لە لایـەنی دوورینی کۆمەڵایەتی و مێژوویی کە بنەرەتی سەرنجەکەیەتی، لایەنی دووربینی فەلسەفی و رەوشتیشی هەبوو.

دۆستۆیفسکی بەتەواوی هەستی بە هەرەسهێنانی رەوشتی چینـە خاون دەسـەڵات و پلەوپایـەکـانی رووسیـای ئەوسـای کردبـوو دەیزانی کلۆڵی و چارەرەشی چینە چەوساوەکان بەهۆی ئەوانـەوەیـەو کارەسـاتی هەرهێنـان و رووخـانی بنـەمـاکـانی رەووشتیی چینـە برژ واو دەسـەڵاتـدارەکـان کارەسـاتی هەموو کۆمەڵگای ئەوروپایی و جۆر ژیانی برژ وازیانەی دۆستۆیفسکی خۆشسیەتی...

دۆستـۆیفسکی زۆر بەوردی لایـەن و هۆبنەڕەتییەکانی ئەم کارەســاتـەی لە ـ تاکـایـەتی ـ وئـەو ـ هۆشکـاری ـ یەوشکـە نابـووتـەدا دەسنیشـان کردکـە هیـچ ئاورێك لە لایەنی گیانیی ناداتـەوەو بەشێـوەیـەکی گشتیش هیـچ بایەخێك بەخواست و پێشبینییــەکـانی مرۆڤ نادات. هەروەهـا دۆستـۆیفسکی ئەم بیـــروبـاوەڕو نەریتـانـەی کە لەرۆژئـاواوەهـاتن و لە نێـوچینـە رکێفـدارەکـانی رووسیـادا بنجیـان دا کوتـا لەگـەڵ برایـەتیی و رەوشتکـاریی ئاسایی گەلین، دوور لە هەموو بەرژەوەندییەکی خوودیی بەراوردکــردو ئەوەی سەلمــانـد کە ئەم برایـەتیی یـە هەمیشـە دیـاردەی چینە هەژارو چەوساوەکانی رووسیابووەو لە پاشــە رۆژ ی دوورڕا دەبێتــە بنـەڕەتی نوێ بوونـەوەی گیـانیی هەمـووجیهـانی بورژ وای رۆژئـاوایی.. ئائـەمەش بوو لەلای دۆستــۆیفسکی سۆزێکی پێشینــەی وای گەڵاڵــە کرد کە بە شێوەیەکی گشتی بوو بە هۆی مەزەنەلێدانێکی دوور لەبارەی مرۆڤایەتی یەوە.

جگە لەوەش دۆستۆیفسکی هەوڵی ئەوەی داوە کە لە رۆمانە کانی دا بەراوردی رەشتیی ئەو کەسـانـەی کە چەپەڵی و نابووتی تامـۆخی سمیبـوون کەسـانی چینی بیروقراتی رۆشنبیر لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکات کە پارێزگاري دەروون و گیانیی خۆیان لە نابـووتی کردوەو نەیـان لە تانـدووە.. هەر لەو هێلەوە پاڵەوانی رۆمـانەکانی پەیدابوون و هەڵکەوتن وەك (سۆنیاما رمیلادوفا)و (میشکنی شازادە)و (مـاکاردولفوروکی) ئائەوجووتیارەی کە بۆ راستی دەگـەڕا. یا (ئـەلیۆشا کارامازۆف) کە لەسەر خواستی خۆی وازی لە رابــواردنی ناو کۆشکـەکـەی باوکی دەرەبـەگی هێناو لە کەش و فەشی ئەو دوور کەوتەوە.

-٣-

خستنـەرووی ئەم ناکـۆکی یـە رەوشتیی یـە تونـدوتیـژە (کە سیـمــای سەرەکیی داهێنــانــەکــانی دۆستــۆیفسکی یــە) پێگـەیسشتن‌ونەشونمـایەکی زۆری دەویست بۆ ئەوەی شەقڵی خۆی بگرێ...

هەروەهــا دۆستـۆیفسکی زۆر دڵســۆزی باوەڕی خۆی بوو لەبـارەی دروستبـوونی تاکـایـەتی کەسـایەتی لەژیانی گیانیی مرۆڤداو ئەو هۆ خوودیی و خۆپەرستی و ئارەزوو بازی یەی کە لەم دروستبـــوونـەوە دێنـەکـایـە، پڕاوپـڕی گێچـەڵی تـرسنـاکن و لەســەرەتــاوە ئەگــەر بەبــێ ئاگــایــیش بێ مرۆڤ بەرەو گۆشــەگیــریــەکی دەروونی نالـەبـارو سەخت رادەکێشن و کەسایەتی مرۆڤ شەت و پەت دەکەن و تووشی رارایی دەکەن

تاکـە رێگـایـەکیش بو خۆپاراستن لەم خود خاپوور بوون و مەرگــە دەروونــی یــە لەرێــڕەوی ژیــانــدا... بەلای دۆستـۆیفسکی یـەوە تەنیـا ئەوەیـە کە مرۆڤ هەست بەم رێگـا تاکایەتی یە داخراوە بکات وئەوەی بۆروون بێتەوە کە چۆن لەم رێگایەدا کەسایەتی مرۆڤ لەبار دەچێ..

هەروەهــا. درك بەو کارەنـاڕەواو چەپـەڵانـە بکـات کە لەو بنـەڕەتـەوە لێـدەوەشێتەوە... جگە لەوەش هەست بەو ئازارە گیانیی و دەروونی یە بکات کە لە ئەنجامی کردارە لارەکانی یەوە دەربـارەی کەسـانی تـر تووشی دەبێ و ژیـانی دەتەنێ. بەرای دۆستـۆیفسکی تاکـەڕێگـایەك کە ئەم جۆرە کەسانە بە مرۆڤانی دییـەوە ببـەستنێتـەوە و برایـەتی یـە ئاسـابییەکەیان بگێرێتەوە، ئەوەیـە، کە ئەو کەسـانـە هەست و سۆز لەگـەڵ کەسانی دیدا پەیـدابکەن و خۆپەرست نەبن و خۆبەختکەرو قوربانی دەربن

**لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی دا . . . دۆستۆیفسکی هەڵچوون و هەستی دەروونیی راستەقینەی چینە چەوساوەکانی گەلی گەیاندۆتە چلەپۆپەی راستی رەشتی .**

دۆستۆیفسکی بەگەرمی هەوڵی دا کەبە هەموو توانایەکییەوە تێکەڵی گێژەنی دەروونی و هۆشیی و ناکۆکی جیهانی ناوەوەی کەسەکانی چیرۆك و رۆمانەکانی بێ ، ئەوانەی کە سەراسیمەی سەر سنووریی تاکە کەسی بوون و داوی ئارەزووی دەروونی و خۆپەرستیی خۆیان کەوتوون کە ئەو کارانە هەمووی بەڵکەو نیشانەی هەرەسهێنانی رەوشتە جا بەپێی ئەوە زۆر بەبێ بەزەبییانە سە بارەت بە کارە چەپەڵەکانیان بەر بارانی نەفرەت و سزای خستوون و وای لێکردوون سەرنجی کارە پووچە دەروونی و هۆشیی یەکانی خۆیان بدەن . . هەروەها وای لێکردوون کاری وا نارێك بکەن کە لەتاوانەوە نریك بێ . . جگە لەوەشی دەربارەی بیروباوەڕەکانی ژیانیان خەریکی مشت و مڕێکی ئەوتۆی کردوون کە لە ترسی سەرنەکەوتن و رووداوە چاوەڕوان نەکراوەکاندا هەڵبلەرزن . . بەڵکو وای لێ کردوون کە هەندێ جار شێت بن . . یا خۆیان بکوژن . .

گەورەترین شت کە دۆستۆیفسکی پێشکەشی خوێنەری دەکات پێشاندان و حستنەرووی ئەو بێ توانایی یە رەوشتی و دووشدامانەیە کە پاڵەواناو کەسە لاورگەکانی کۆدەکاتەوە کە ژیانی تیروتەسەلی و پرابواردن دەبەنە سەر وەکو (سفیدر یجیلوف) و (ستافروغین) و (فیرسیلۆف) دۆستۆیفسکی لەنێوانی لایەنە جۆربەجۆرەکانی بیرۆکراتی یەکاندا هەندێ کەسی وەکو (راسکۆلینکوف) و (ئیفان شاتۆف) و (ئەرکادی دولفۆروکی) و (دیمتری کارامازۆف) بەدی دەکاو بۆ ئەوە هەڵیان دەبژێرێ کە ئومێدی ئەوە هەبێ نەریت و هەست و سۆزی گیانی ومانەوی لە هەستییاندا ببوژێتەوە . بەڵام کەسانی ئیجابی وەکو (سۆنیا) و (شازادەمیشکین) و (ماکار ئیفانۆفیش) و (ئەلیۆشا) بە گەلێ شێوە رەمزو رەنگدانەوەی رووناکایی یە . . رووناکایی گیانی و مانەوەی هەروەها بەزەیی و یەکگرتنی و هاریکاری و قوولایی مرۆڤایەتی یە .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنی کە بیروباوەڕی رەوشتیی و نارەوشتی ژیان لەبەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی دا (وەکو لە بەڵگەو هیما مانەوی یەکانیاندا بە شێوەیەکی نائاسایی ئاشکرایە) رووتەڵەو تەنیاو جیاواز نیە بەتەواوی . . . بەڵکو باسی لایەنە تایبەتی یە کاری گەرەکانی کەسە کۆمەڵایەتی یە جۆربەجۆرەکانی رووسیا دەکات ، لەدوای سەپاندنی یاسای هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی دەربەگایەتی دۆستۆیفسکی بەراستی و هەموو واتایەك نووسەرێکی ریالیستی یە .

- 4 -

ئەمەش وای لێ کردووە کە زۆر بەوردی و قووڵی یەکی تایبەتی وێنەی بنچینە جەوهەری یەکانی ژیانی کۆمەڵی سەردەمی خۆی بکێشێ و لێی بدوێ و بەتایبەتی یە نائاسایی یەکانی دا بچێتە خوارێ . ئا ئەمانە هێڵە بنەڕەتی یەکانی بەرهەمەکانی دستۆیفسکین کە گەلێ لە رەخنەگران گەرەکیان بووە پشت گوێی خەن . لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە هێرش کردنە سەر بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی دەستی پێ کرد ئەویش لەلایەن هەندێ نووسەری بەزیوو رووخاوی رووسییەوە کە گوایە هەندێ لایەنی سۆفیگەرانە لەبەرهەمەکانیدا هەیە . . ئیتر لەوساوەو دوابە دوای ئەوان بڕێ لە نووسەرە بەزیوو رووخاوەکانی رۆژ ئاواش کەوتنە ئەو جۆرە قسەوباسانەو هەتا ئێستا ئەم تەشی رستنەش هەر بەردەوامە .

بەڵام دەبێ کاکڵەی مێژووی دۆستۆیفسکی لە داهێنانەکانی دا لە هەموو لایەنێکەوە بخوێنرێتەوە جا ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ کەلایەنی گشتی ئایدیۆلۆژی لە رۆمانەکانی دا بە گوێرەی کۆمەڵگای ئەوسای رووسیا زۆر بەبایەخ و گرنگە . . بەڵێ چیرۆك و رۆمانەکانی حوکمی تاوانبار کردنێکی بەهێز بووە دەربارەی هەرەسهێنان و رووخانی رەوشتی چینە بەرزەکانی رووسیای کۆن .

ئەم حوکمە لەلایەنێکی مێژوویی یەوە دەربڕینێك بووە پێشبینی دۆستۆیفسکی پێشان دەدا . . ئەویش لەوکاتەدا کە

ڕووخـانی ڕەوشتیی کۆمـەڵـە برژ واو دەرەبەگە دەسەلاٚتدارەکان ڕێگـای ڕووخـان و هەرەسهێنـانی کۆمـەلاٚیـەتی و رامیـاری و تەراژ یـدیـانی خۆشی دەکـرد. ئەوە بوو ـ 36 ـ ساڵ بەسـەر مەرگی دۆستـۆیفسکی دا تێپـەڕی وتێنـەبـەڕی هەمـوو ئەوچینە دەسەلاٚت دارانە جڵەوی حوکمیان دۆڕاندو لە دەسەلاٚتداریتی دوورخـرانەوەو هێزی کۆمەلاٚیەتی نوێ هاتنە مەیدان و جڵەوی دەسـەلاٚتـداری ولاٚتیان گرتە دەست و وردەوردە ولاٚتیان خستە سەر ڕێگـای پێشکـەوتنی جیهـانی. ئالێـرەوە ڕوومـانەکانی دۆستـۆیـفسکی زۆر یارمـەتیمـان دەدات لە تێگـەیشتنی کۆمەڵگای بو رژ وای هاوچەرخ دا.

هەرچەن پاڵەوانە کۆمەلاٚیەتییەکانی دۆستۆیفسکی ئەوانەی کە هەڵیـانـدەسەنگێنیٚ و بەررەخنەیان دەدات بەپێی مێژ ووی سەردەم سەر بەرووسیـای کۆنن بەلاٚم لەگـەڵ ئەوەشـدا هەتـا ئێستـاش لە کۆمـەڵگای برژ وازی و تایبەتی یە مێژ وویی پەکاندا دەژ ین و دووپات دەبنەوە.

هەتـا ئێستـاشلەجیهـانـدا کەسانی وەکو (راسکۆلینکۆف) و (کـارامـازۆف) زۆرن و بەرپەرچی هەمووڕەوشت و نەریتێکی مرۆڤایەتین و لە کردنی هیچ تاوانێك کەمتەرخەمی ناکەن.

هەروەهـا هەتـا ئێستـاش کەسـانی وەکـو (ستـافورجین) و (فێـرسیلۆف) هەن کە بەرواڵـەت بایـەخ بە بۆچـوونـە ئەقڵی و هۆشییـەکـانیان دەدەن بۆ ئەوەی لەو پەناپەوە هەژاریی یە گیانی و دەروونی یە نهێنی یەکانیان داپۆشن.

لەراستیشـدا کۆمـەڵگای هاوچەرخی بورژ وا کەسانی وەکو (بییـرفیـرخـومنینسکی) زۆر تیایە کەخواست و ئاوات و خۆزگە رامیـاریـیـەکـانی خۆیان و سەرکەوتنیانیان لە هەمو شتێکی تر بەلاوە گرنگترە.

لەلایـەکی تریشـەوە ئایـە بە شێـوەیـەکی گشتی ڕێبـازە ڕەوشتی یـە ئیجـابییـەکـان. لە داهێنـانەکانی دۆستۆیفسکی دا نرخ و بایـەخی خۆیـان لەدەسی داوە؟ . . . یا بشێ ڕاست بێ کە لە کۆنترین ئاواتە مرۆڤایەتییەکانی دووربێ؟

گومـان لەوەدا نیـە بوونی کۆمـەڵگـا هەستی کۆمـەلاٚیـەتی دروست دەکـا. بەلاٚم ئەم کارە بە شێـوەیـەکی ئامێـرکـاری نایـەتـەکـایـەوە. ئا لەم رووە دۆستـۆیفسکی مەسـەلـەکـەی هەڵـسـەنگـانـدوەو ڕوونی کـردۆتـەوە کە هەست کردن بە کەم وکـووری خوود قایلمـان ناکـات. بەلاٚم هەست کردنی قووڵـی ڕەوشـتـیـی دەربـارەی کەسـانـی دی سەبـارەت بەلایـەنـە گشتی و تایبـەتی یەکانی ژ یان. یان هەست کردنی دڵسـوزانـەو بەهێـز بەنارەزایی لە خوودی خۆ. ئەویش لە کاتی سەرنەکەوتنی مرۆڤدا لەوبارەیەوە. ئا ئەوە کارێکی ئاسایی یە بۆ ئێمە.

ئێمـە هەرگیـز رازی نابین بەوەی کە کوێـرانـە کەسـایـەتی خۆمـان و خواست و ئاواتـەکانمان بدەین بەلاٚم مرۆڤ ئامادەیە لەڕێـگـای جێبـەجێ کردنـی ئاوات و بەرژەوەنـدییـە گشتی یـەکـانـدا بەرژەوەنـدی کەسـایـەتی خۆی جێبـەجێ بکـات و بەدیبـهێـنـێ. ئەم کارەش سەنـگـی محـەکی راستەقینەی ڕەوشتی مرۆڤە.

ـ 5 ـ

گومـان لەوەدا نیـە کە کاکڵەی هونـەریی بەرهـەمـەکـانی دۆستۆیفسکی لە ڕۆشنبیریی جیهاندا بایەخێکی گەورەی هەیە.

ئەوبیـروراونـاوەرۆکـە بەهێـزانـەی کە لەبـارەی شیکـردنی دەروونی یەوە تێکەڵی نووسینە کانی کرد داهێنانێکی پتەوو لەبار بوون لە قوڵڵەی وێژەی ڕووسی و جیهانیدا.

دۆستـۆیفسکی شانبـە شانی (نیکـۆلایفیـچ تۆلستـۆی) لە بواری پێشکـەوتنی هونەری مرۆڤایەتیدا هەنگاوی گەورەی ناو گەلێ لە نووسـەرانی ڕووسی و جیهـانیش دوای ئەو هەنگـاوانە کەوتن و پەرەیـان پێـداو بۆجێبـە جێکـردنی ئاوات و خواستـە ئایـدیـۆلـۆژ ی و داهێنانە تازەکانیان بە گەلێ شێوەی جۆربەجۆر لەو ڕێبازەوە کۆششیان کرد.

ـ ٥ ـ

ئائەمە بوو کورتەی کاکڵەی هەمو جۆری کەلەپووری دۆستۆیفسکی.

ئائەم کەلەپوورە لەراستیدا سەرمایەی جوولاٚنەوە پێشکەوتن خوازە کۆمـەلاٚیەتییەکانی ئەم سەردەمەیەو ئەرکی سەر شانیەتی لە دوژمنان بپارێزێ.

# پەڵە هەورێکی خەمباری

ئیسماعیل رەسوول

خەفەت وەکو پەڵە هەورێکی رەش روخساری دادەگرت و تێروانینێکی غەمگینی لە هەردوو چاوە رەشە جوانەکانی دەردەپەڕین ، ئەو رەنگە ئاڵەی سەر دوو کوڵمە گەشاوەکەی و دوو لێوە تەنك و ناسکەکانی بەدی نە دەکراو هەروەها زەردەخەنە دڵرفێنەکەی و پێکەنینە ساوایەکەی لە سەر دەموچاویدا وەك تیشکێکی رۆژ ی ئاوا بوو کوژابوونەوەو سێبەرێکی زەرد هەڵگەراویی بە دوای خۆیدا جێ دەهێشت.

بە شێواویی لەبەر خۆیەوە دەیگوت و دەی گوتەوە: «بۆوا غەمگینە دەبێ تووشی چی هاتبێ ؟!». ویستی پرسیاری هۆی ئەم غەمباریەی لێ بکا، بەڵام وای پێ باشتربوو هێشتا چاوەروانی بێ ، چونکە لەگەڵ دایکی و «پەروینی» خوشکە بچووکەکەی هەر بەردەوامی چرپە چرپەکەیان بوون، کەلێیان دەهاتە ژووری چێشتلێنانەکە، بۆپیویستێ، قسەکەیان دەبڕی و خۆیان کڕ دەکرد. هەر ئەوەش بووزیاتر دەی شێواند. . «باسی شتێ دەکەن و لەمنی دەشارنەوە. . دەبێ لەبەر چی بێ ؟!».

بوتلی وێسکیەکەی لەسەر مێزە خرەکەدا هەڵگرت و کەمێ وێسکی تێکردە ناو پەرادخەکەوەو کەمێ ئاویشی کردە سەرو قومێکی زلی لێدا! ، دنکە پاقلەیەکی بە دوو پەنجە لە قاپەکەی بەردەمی هەڵگرت و هاویشتی یە ناو دەمی و کەوتە کرۆشتن و جوینی. ئاورێکی لە ژنەکەی دایەوە تیرەییکی لەسەر لێوانیدا وە دەر کەوت:

چەند مانگێکە تامی فرێکیشم نەکردووە.

ژنەکەی پێکەنی:

مەترسە، لۆمەت ناکەم ، ئەوە دەزانم کە چەند مانگێکە وازت لەمەی خواردنەوە هێناوە.

جاچ پێویست دەکا لۆمەم بکەی؟. خۆنەم گوتووە بە یەکجاری نای خۆمەوە. . ئەی نابیتی هەڵکەوتێکی دڵخۆشکەرەوەیە؟ ئەوەی راست بێ من لۆمەم کرد، پێم گوت: «کچم نە دەبوایە دەدیناری رەبەق بەم شووشە ژەهرە بدەی، ئایا باشتر نەبوو گەر کراسێك یا بۆیمیاخێك یا هەرشتێکی دیکەی بە سوودت بە یادگاری بۆبهێنایە؟. بەڵام وادیارە خۆت ئەوەت ویستووە!

ئەویش پێکەنی و پڕیدایە بەرداخەکەو چووە دەرێ، بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد:

ئەوە لەبەر چی نایەنە هۆڵەکە ، سەیری بەرنامەکانی تەلەفزیون بکەن؟! . . یا پێتان خۆش نییە لەگەڵ منا دانیشن!.

پیاوەکە دە تۆ برۆ ئێمەش بەدوای تۆدا دێین.

ژنەکەی ئەوەی بەتوورەیەوە گوت. ئەویش تێگەیشت کە هێشتا قسەکەیان تەواو نەکردووە.



لەسەر قەنەفەکە بەرامبەر تەلەفزیۆنەکەوە دانیشت، دەنگە بەرزەکەی پەستی کرد. لەپڕ هەڵساو نزمی کردەوە، دووبارە دانیشتەوە، بەڵام مێشکی وەکو پەردەی تەلەفزیۆنەکە کەوتە جوولە، وێنەو دیمەنەکانی بەخێرایی بە دوای یەکدا دەرویشتنی.. وێنەی کچەکەی هاتەوە بەرچاو، کە پێش دوو مانگ لەمەویەر فەرمانی دامەزراندینی بە مامۆستایی قوتابخانەی ئامادەیی وەرگرتبوو، کەیف خۆشیَ روخساری وەکو رۆژ گەشاندبۆوەو تیشکی دڵخۆشیش لە چاوەکانیدا بریسکەی دەدایەوە.. سەرنجی دەدایە فەرمانەکەو پێکەنین دای دەگرت. دڵخۆشی یەکەی ئەویش لە هی کچەکەی کەمتر نەبوو. ئێستاش ئەو رۆژەی، پێش بیست وپێنج سال لەمەو بەری دێتەوە پێش چاو کە بۆیەکەمجار بە فەرمانبەر دامەزرا، بەڵام نایەتەوە یادی کە تووشی ئەم جۆرە هەستەو دڵخۆشییە هاتبێ.

ئەوا لەو رۆژەوە تا ئێستاو بە درێژایی ئەو ساڵانەی رابووردوودا هەر لە کارکردنێکی هەناسەبڕ و هەوڵ و تەقەلایەکی بێ وچان بووە، کەمتەرخەمی لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی هەر چوار منداڵەکانی نەکردووە، رەنجی ئەو ئیش کردنەی دابین کردنی پێویستی ژیانیان وفێرکردنیان خەرج کردووە. چاوەڕاوانی ئەو رۆژەی دەکرد، بە گەورە یی بیانبینێ، وەك باڵندە پەروباڵ دەربکەن وبفڕن وپشت بەخۆیانەوە ببەستن و بەدوای خۆراك پەیداکردن وخۆپاراستن و هێمنی ودڵخۆشییدا بگەڕین.. دووکورودووکچن، بەرهەمی تەمەنی پەنجا ساڵیەتی. (جوان)ی کچە نۆبەرەی، بیستو دوو ساڵی تەمەنی تەواوکردووە. ئەم گوڵە بەهارەی ناسك ولاچك لاوازە نەماوە کە بەرامبەر نیمچە بایەك بهەژێتەوە وپەرەکانی هەڵوەرێن وپەرش بڵاوببنەوە، ئەوا بووە بەشلکە نەمامێك، دەتوانی خۆی لەبەر شالاوی زریانیش راگرێ.

ئەوەی لە نێو دۆست و ناسیارانی شانازی پێوە دەکا ئەوەیە کە توانیویەتی بە چاکی پەروەردەی بکا، گەلێ جاریش لەبن گوێی دەی چرپاند: «کچم جوانی بە تەنیا بۆ ئافرەت بەس

نییە، هەرچەندە پیاوە لەسەرەتادا شەیدای دەبێ، بەڵام ئەقڵ و هوشیاری وزانین رەفتاری جوان ئەگەر هاتوخرانە سەر جوانیی ئەوە ئافرەت دەکا بە ئەفسانەیەك، پیاوان گورانی پێهەڵدەڵێن».

کچەکەی بەغەمگینی وەڵامی دەدایەوە:

بابەگیان جاری یەکەم نییە ئەم قسانەم بە بەر گوێ دا دەدەی.. چییە باوەرت پێم نییە؟!.

کچم دڵگیر مەبە، دوویات کردنەوەی قسەیەکی بەکەڵك لە قازانج زیاتر هیچی تر نابەخشێ لۆمەم مەکە، من بەر لە خۆشەویستی تۆدا، ئەو قسانەت بۆدەکەم وتاگییری ئەم براوایەش نەبی کە جوانی بۆ ئافرەت، بە هەموشتێك دا بنێ ی.. ئا نەکەی بێالسی یە داوی ئەم گرێ یە؟.

ئا ئەوە دەزانم کە لە مێژە دەرحەق بەژنی جوان خاوەنی رایەکی تایبەتیت!.

چۆن؟!

ئەی نایەتەوە یادت کە بە منت دەگوت، گوایە زۆربەی ژنە جوانەکان گێل و دەبەنگن؟.. نازانم لەوە دەترسای کە منیش وەکو وان بم؟!.. دیتەوە یادت چۆن جارێکیان بە شەقا زللە روومەتت سوور هەلگەراندم؟، ئاورم لێدایەوە دیم، گلپەی ئاگری توورەبونت لە چاوەکانتا دەر دپەرێ، بە سەرما هاوارت دەکرد: «ئەگەر جارێکی دیکە کلم لە چاوان دیتی و دەمو چاوت بەم بۆیاغە پیسە سواغ درابوو ئەوە بێ سێ و دوو پەراسوەکانت وردوو خاش دەکەم، وەکو درایکی گەندەڵ مریت دەدەمە ناوئاگری ئاگر.. تێ دەگەی؟.

چییە ئێستاش هەر لێم زوێری؟!.. وادیارە نایەتەوە یادت کە ئەوسا کە بچووك بووی و هێشتا قوتابیی پۆلی یەکەی می کۆلیجەکەت بووی.. ئا لەبیرمە کەپێت دەگواتم:

«دەستە خوشکەکانم هەمویان وا خۆیان دەرازیننەوە» ئەوەشم لەبیرە کە منیش پێم دەگوتی: «.. نابێ لاسایی ئەم جۆرە رەوشتانە بکەیت، زانکۆجێ فێر بوونی زانست و رەفتاری چاکە، واخوت فێرکە ببی بە نمونەیەك تا بتوانی ئەرکی فێرکردن و پەروەردە کردنی نەوەی نوێ بە چاکی بخەیتە ئەستۆ.. دێتەوە یادت؟..»

بابەگیان باش دیتەوە یادم. من هیچ لە تۆ زوێر نیم بە پێچەوانەوە دەبێ سوپاست بکەم، بەبێ تۆ نەدەبووم یە هیچ.. لێم ببوورە، ئەوساکە هێشتا منال بووم، تەجرەبەم نەبوو.

پاشماوەی پەرداخەکەی هەڵ لووشیو لە جیگاکەی قیت بۆوەو بەرەوژووری چێشتلێنانەکە چۆوە، تا لەوێ پێکیکی دیکە بۆخۆی ساز بکا. تا ئەوکاتە هەستی بە هیچ جۆرە سر بوونێك نەکرد بە لەشیدا دابگەرێ، لەناخی دڵییەوە سوپاسی کچەکەی دەکرد کە لەو شارە دوورەوە ئەم شوشە وێسکییەی بەدیاری بۆ هێناوە. حەفتەیەك دەبێ خۆی بۆ ئەم خواردنەوەیە ئامادە دەکا.. دەی زانی کەی پشووی نیوەی ساڵ دەست پێدەکا. لەکاتی خوێدا بە تەلەفۆن پیی گوتن کە رۆژی سێ شەممەی رێکەوتی یەکی شوبات دەگاتە جێ. دووکورەکەی و کچەکەی تریشی و هەموویان چاوەر وانی ئەو رۆژەیان دەکرد. بەڵام ئەو لەوان زیاتر هەستی بە دڵخۆشی دەکرد: «چی تێدایە با کەیف خۆشییەکەمان بە تەواوی دیمەنی دۆینێکەی (جوان)ی هاتەوە بەرچاو.. لەناو کەل و پەلی جانتاکەیدا شوشەیەکی هێنایە دەرو وەکو کۆرپە منالێکم خستبویە ئامێزی بە پەلە بەرەو هۆڵەکەوە دەهات و بەدەمێکی پر خەندەوە گوتی:

بابە ئەوەتا دیاري یەکەی تۆ. سەیری کە، لەوبابەتەیە کە حەزی لێ دەکەی بەخوا دە دینارم پێداوە.

بەڵێنی ئەم دیاری یەی، لەسەردانە کورتەکەی مانگی رابووردوودا پێ دابوو. یەکەمین سەردانی بوو پاش دامەزراندنی. دیاری بۆ هەموان هێنابوو.. بۆدایکی، پەروینی خوشکی، بۆ هەردوو براکانی بگرە بو پلکەکانیشی.. ئەو مووچەیەی وەری گرتبوو هەمووی بۆیانی خەرج کردبوو، چەند دینارێکیشی لەسەر قەرز کرد بوو.

بەڵام باوکی تاقەکەس بووکە هیچی بەبەر نەکەوتبوو، بۆیی کچە بە شەرم دادەچ، غەمگینی دای دەگرت، لۆمەی خۆی دەکرد، چۆن لەبیری بۆ باوکیشی دیاریی بهێنێ؟...

دەبوایە ئەوسەرپشکی هەموان بوایە . . لەوانەیە ئەوساکە بەم جۆرە بیری نەکرد بێتەوە، وا راهاتبوو کە هەر لیێ وەربگریّ ویستی هەڵوێستەکەی راست بکاتەوە: «بابەگیان لیّم ببوورە هیچ شتێکم بۆنەهێناوی، بەڵام بێگومان لە پشووی نیوە ساڵدا شتێکت هەر بۆدێنم . . بریارم داوە شووشەیەك وێسکیت بۆ بێنم . ، . قایلی؟ . »

بۆنا؟ . شتێکی دڵخۆشکەرەوەیە، بتوانی بەرەنجی خۆت بۆ باوکت دیاری‌یەك بهێنی . . بە درێژایی تەمەنم چاوەروانی رۆژێکی وام دەکرد، جا ئەو دیاری‌یە هەر چی‌یەك بیّ، گرنگ نییە .

چرپە چرپ لە نیوانیاندا هەر بەردەوام بوو. قومێکی لە وێسکیەکەدا داو کەوچکە ماستێکی رژاندە نێو دەمی و بە دەنکە پاقلەیەك تامی زاری خۆش کردو بەزمانی لێوەکانی لستەوەو لەسەر کورسییەکەی بەرامبەریان دانیشت و گوتی :

نازانم ژنە چیت لەومەتبە قە دیوە؟ . . بۆزۆربەی کاتتان لێرە دەبەنەسەر؟ . . ئەی لەبەرچی ژووری مێوان و هۆڵیان دروست کردوە، گەر ژووری چێشتلێنان بەس بیّ؟! کابرا نازانم چیت لیّمان دەویّ؟! . . رۆژ نییە ئەو قسەیەم بەبەر گوێ دا نەدەی، ئەی بۆکوێ بچین؟ . .

شتێکی ئاسایی‌یە گەر جیگام ئێرەبیّ .

چی بکەم، بارگرانی هەموتان کەوتۆتە سەر شانی من؟ . . هەر لەبەرەبەیانەوە، تا رۆژ ئاوا دەبیّ لەم ژوورەدا کاربکەم خەریکی چێشتلێنان و قاپ و قاجاخ شوشتن و گسك لێدان و کاشیی سرینەوە بم جل شۆرینیش سەر بار خۆلەورۆژەی خانەنشین کراوی، کەس باری تۆیی پیّ هەڵناگیری، رۆژی دەجار قاوەو چایم پیّ لێدەنیّ . لەوەتی زستانیش داهاتووە، ئەوە دبیّ ئاوت بۆگەرم بکەم تا دەموچاوی پیّ بشۆریی و کیسە لاستیقەی پر بکەم تا بیخەتە بن قاچ و قوڵت . . سەرەرای ئەم هەموو بارگرانیەتان لۆمەشم دەکەی و پیّیم دەلیّی بۆهێندە لەمەتبەق دادەنیشی؟! .

هەستی پێکرد ژنەکەی لیّ توورە بووە، هۆی ئەم توورەبوو نەشی، لۆمە کردنەکەیەتی و هەڵتوتکانی بەرامبەریان و گوێ گرتنی لە گفتوگۆکەیان، بۆیەش رێچگەی قسەکانیان بریی، ئەویش کەوتە بیرکردنەوە، . . دەبیّ دووقسەی خۆشیان لەگەڵ بکا، هێمنی بکاتەوە، چونکە ئەوەی گوتی راست بوو. وەکو مەکینەی ئاش بە درێژایی رۆژ لە کار کردن ناکەویّ، بۆ ئیشیکی پێویست نەبیّ لەماڵەوە ناچێتە دەر هەر خۆی بۆ شتومەت کرین بەسەر دوکانەکانی گەرەکەکەیاندا دەگەریّ، بۆ کرینی چەند ئاروو پرتەقاڵ گەلیّ جاریش رێگا دوورو درێژەکەی پر قولت چاڵەکە دەبریو تا سەموون لای فرۆشیارە خاوەن کوشکەکە بێنیّ ئەوەی رۆژی لەرۆژان پێش ئەوەی خانە نشین ببیّ، مامۆستا بۆ، منالانی فێرگەکانی سەرەتایی، فێری خوێندن و نووسین دەکرد، ئێستاش ئەوەیە پیشە . . پیاوە ئەوشی دەزانی کە ژنەکەی، کرو کچەکانی بە جۆریّ خۆش دەویّ، ئامادەیە لە پێناویاندا خۆی بتوێنێتەوە. دڵیکان بە ئارامیی چاوەروانی ئەو رۆژە دەکەن، کچەکانیان گەورە ببن تا ئەرکی ئیش کردنی ماڵەوەیان لەسەر کەم بکەنەوە، بەڵام ئەو بە پێچەوانەیان لیّ ناگەریّ پووشێك هەڵبگرن و هەر ئەوەوتا پارووشیان ناخاتە قورگ، تا لە خوێندیانا دوا نەکەون، چونکە دوا رۆژی ئەوانی بەدوا رۆژی خۆی دەزانی، ئەو ئاواتەی پیێ نەکەیشتیوو دەیەویست بەرێگای ئەوانەوە بۆی بێتە جیّ ئەویش ئەوە بووکە لەخوێندن بیّ بەری کرابوو. پیێ شوورەیی بووژنەکەی نەخەویندەوار بمێنێتەوە، بۆیی گەلیّ جار لەگەلیی دەکەوتە کێشمە کێش و بەسەریا هاواری دەکرد:

ئافرەت نازانم چیت لێبکەم؟! . . ئەوە بیست و پینج ساڵە هەوڵ دەدەم فێری خوێندن و نووسین ببی، بەڵام وا دیارە ئاسنی سارد دەکوتمەوە .

ژنەش وڵامی دەدایەوەو دەی گوت :

«کابرا چیت لیّم دەویّ؟ . . دەتەویّ بە پیری بچمە بەر هەویریی ئەوەی فێری بووم بەسمە . هەر نەبیّ دەتوانم ناوی خۆم بنووسم و چەند سەرناویکیش بخوێنمەوە . خوێندنم بۆ منالەکانمان جیّ هێشتوە، با ئەوان دوا رۆژی خۆیان دابین بکەن، ئێمە چیمان لەچی‌دا ماوە، منیش پیّم خۆش نەبووو وا منیان لە خوێندن دابریی لە بەدبەختی خۆم دایکم تەنها منی

لە فێرگـە دانـەنـا دەی گوت: «گـوڵشن نەبێ کەسیی ترم نییە یارمـەتیم بدا با ئەوبێ بە کایـانی ماڵ» . . بـەڵام پێم ناڵێی بۆ هێندە ئەم قسـەیەم بەرگوێ دا دەدەی؟!

وا دەزانی هێندە گێلم ئاگادار نیم بیر لەچی دەکەیەوە؟

. . بـۆ بە ئاشکـرا قسـەکـە ناکـەی؟ . . خۆبلێی دەمـەوێ ژنێکی فیرکار یا فەرمانبەر«دە»خوازم و بیریتەوە؟ . . لەوەتی منت هێنـاوە بیر لەوە دەکەیتەوە ناحەقیشت نییە چونکە پیاوانی ئێستا شەیـدای ژنی فەرمـانبـەرو مووچـە خۆرن بەدوای ئەوچەنـد قرۆشـەی وەری دەگـرن، دەگـەرێن . . خۆمن رێگـام لێ نەگـرتـووی ئەگـەر بە من قایل نیی برۆ گەردنت ئازاد بێ ، کێ دێنی بێنـە دەیـان جار ئەو قسـەیەم پێ گوتووی بەڵام دەمدیتی چۆن وەکـو من جیگـات ژووری چێشـتاڵێنـان دەبوو، قاپ و قاچاخ شوشتنیش دەبووە پیشەت.

لە ژنـەکـەی رامـا، ئەوەی سەرەنجی راکێشـا ئەو شێوان و غەمگینییـە بووکە بە روخسـارییـەوە نووما بوو، پەردەیەکی خستـبـووە سەر ئەو دڵخـۆشییـەی کە بـە درێـژایی حەفتـەی رابـردوودا دەی گـەشـاندەوە . . دیتـەوە یادی وەکـو پەروانـە لە ژووری چێشتلێنـان وئەم لاوئەولای ماڵچکـەیاندا دەخولایەوە ، خەریکی ئامادە کردنی ئەوخواردە مەنیـانـە بووکە (جـوان)ی کچی حەزی لێ دەکـرد مانگێکی رەبـەقـە جوانی لەبەر چاوبزرە، ئەدی کە نەیتوانیوە بێ دیدەنی کچەکەی چەند سعاتیکیش ئارام بگرێ . . ئەوڕۆژانەی کە لە زانستگـا درەنگ دەگەرایەوە، لەپەنجەرەی مەتبەقەکەوە چاوی لە دەرگـاکـەی دەرەوە دەبـری ، بـە پەشـۆکـاویەوە چاوەراوانی گەرانـەوەی دەکـرد ، چەنـد جاریش دەچـووە بەر دەرگاکەو چاوی لە رێگـا درێـژە خوڵاویـەکە دەبری، کە بە شەقامەکەی نزیـك ماڵیـانـەوە دەگەیشت بەلکو لە دوورەوە چاوی بە خۆیو جانتا رەشەکەی دەستی بکەوێ، وە کە دەگەیشتە ماڵەوە بە پەلە دەرگاکەی بۆ دەکردەوەو هاواری وەکرد:

کچم خۆ ئۆقرەم لەبەر برا ، ئەوا بۆوا دوا کەوتی؟!.

دایـە، ئەی پێم نەگـوتی ئەو ڕۆژانـەی لەزمـوونگە ئیشمان هەبێ، دوا دەکەوم؟.

دایکت بمـرێ ،دەزانم ئێستاکە لە برسانا مردووی . . زوو بە وەرە ژووری بـبـیـنـە چیم بۆلێنـاوی . . دەمـزانی حەزی لێدەکەی . . بریانی یەکە پەنجەی لەگەڵا دەکرۆژی.

دایە گیان پەلە مەکە . ئیشتهام گیراوە.

وەاللاهی ناحەقەت نییە . چۆن ئیشتهات نەگیرێ کە هەر لە بەیـانـیـیـەوە خەریـکـی ورگ هەڵـدرینی بۆق قرژاڵ و جاڵ جاڵـۆکـە بن؟! . . نازانم لەبەرچی ئەو بەشەت هەڵبژارد چی پێ دەڵێن ب . . ب . با . خۆ ناوکەیشم لەبیر چووە!.

دایە پێی دەڵێن بایولۆجی، دەیان جارە ئەوەم پی گوتی هەر پێت لەبەر نەکرا؟!.

ئاراست دەکەی هاتەوە یادم باڵوجی . . هی . . هی

دەزووکـە وەرە ژووریێ ، مـانـدوو دیـاری ، ڕەنگت زەرد هەڵگەراوە کۆستم کەوێ نازانم ڕەنگـە ئاڵـەگـەی سەر گۆنات بۆ کوێ بە پەلـە خواردەمـەنیـەکـەی لەبـەر دەم دادەناو بەرامبەری دادەنیشت، تا لە خواردن دەبۆوە ، پاشان پیاڵە چایەکی گەرمی بۆ تێدەکردو کەیف خۆشی دەهاتەوە بەر.

ئەرێ پێم ناڵێن ئێـوە خەریکی چین؟! . . لە ئێـوارەوە لە چرپە چرپ دان . . ئافرەت دیارە شتێك هەیە بە منی ناڵێن؟

. . جوان غەمگین دیارە تووشی هیچ گرفتێ هاتووە؟.

باوکـە ئەمـەی گوت و بە کورسییـەکەی ژێریەوەی ناولیێان چووە پیش ، دەسـتـی بۆ سەر زۆپـاکـە دریـژ کرد هەر دوو لەپەکانی لەیەك خشاندن. دایکەش بە توورەیەوە وەڵامی دایەوە:

ئەی ئاگات لێ نییە ، دوو چاری چەندین گیرو گرفت هاتـووە؟! . . دایکت بمـرێ دەمـزانی بەبێ ئێمـە ناتوانی بژی ، بۆ خۆت نازانی بەناز بە خێومان کردووە؟ . .

من بەدەستی خۆم پارووم دەخستـە قورگی ، بەڵام ئێستـا کێیێ لا هەیە ئاگای لێبێ؟ . . سەیری کە چەند لاواز بووە، چۆن زەرد هەڵگەراوە؟!.

تاوێ کربوو، لێشاوی فرمێسك دەموچاوی شوشتەوە.

ئەوگریـانـە لەچی؟ . . ئافـرەت هیچ گرفتێك نییە چارەی نەکـرێ. وا باشتـر نەبـوو ئەوەی لە دڵتـانـدایە پێکەوە باسمان

بکردایە و ڕێیەکی ڕەوامان بۆ دانیایە؟ .

کچم هەموو شتیکی بە ئاشکرا پێ بلێ .

باوکە هەڵیدایی و لیێ پرسیی :

وا دیارە پێت خۆش نییە لە مالێ خالّت بمێنیتەوە؟ . .

چییە لێیان دڵگیری ؟ئەترسم سەعدیەی ژنی بە بارگرانیت دابنێ؟! .

بابە کێشەکە هەر ئەوە نییە . ئەوەی حەق بێ ژنێکی باش و دڵسافەو منیشی خۆش دەوێ ، بەڵام چی بکا ئەویش فەرمانبەرە ، لە بانقی شارەکەدا کار دەکا ، بەیانی دەردەچێ وسعات سێ ی پاش نیوەڕۆ بەماندوو مردوویەتی دەگەڕێتەوە کێشەی منداڵە وردیلەکانیشی سەر بار خاڵوم تا ئیستا سەربازەو لەبەرە بەیانەوە دەچێتە ئۆردی ، خاڵۆژنیشم ناچار هەر خۆی بەسەر باغچەی منالان و فێرگەو مالێ دراوسییان دا دابەسییان دەکا وخۆیشی بیانهێنێتەوە ماڵەوە ئەو بە ئەرکی ماڵەوەش هەڵبستی .

جا خۆت لێکی دەرەوە لە چ بارێکدایە . من هیچ لۆمەی ناکەم بیگومان بۆی ناکرێ ئاگای لە منیش هەبێ بەڵام گیرو گرفتەکەی من هەر ئەوە نییە؟ .

باوکە گوی بۆ قسەکانی شل کردو بەسەر سوورمانەوە گوتی :

ئەی چییە؟! .

بابەگیان ، بۆ ئەوەی بە دەوام را بگەم ، دەبێ لەبەرە بەیانەوە لەخەو هەڵسم بە پەلە جلم بگۆڕم و لە سعات شەشیش لە ئێستگەی ئەمانەدا رابوەستم . ئەگەر هاتو چەند چرکێك دوا کەوتم ئەوا پاسەکە بەجێم دەهێڵێ ودەبێ سعاتێکی رەبەق چاوەروانی گەڕانەوەی بکەم جا بۆیی گەلێ جار بە فریای دەوام ناکەوم قوتابیان دەرسێکیان لەکیس دەچێ . جگە لەوەش

خۆت ئەزانی زستانی وێندەری چەند سەختە ، بە تایبەتی کە بەفر هەموو شوینێك دا دەگرێ ورەشەباو تۆفی زستانیش ئەوەتا دارو درەخت لە رەگەوە دەرناکێشی و ئوتومبیلەکەش لە پێچەکانی شاخەکە هەڵناداتە خوارێ . هەر جارێ کە ڕۆژێکی تۆفی وادا بگەرێمەوە شار تۆقین دام دەگرێ ومتمانە ناکەم بە سەلامەتی بگەرێمەوە ماڵ . . ئەوە بێنە بەر چاووت ، هەموو رۆژێ دەبێ لەبەرە بەیانەوە بۆ فێرگەکەم بچم و ئێوارانیش بەماندووەتی بگەرێمەوە ، زۆربە کاتیش لەوڕێگاو یانانە بەفیرۆ بدەم تا رادەیی هیچی ترم بۆ ناکرێ .

کچە تاوێ لە قسەکردن وەستا ، باوکەکەیشی بە پەرۆشەوە تێ رادەما ، کە چاوە گەشەکانی دی ببوون بە دووگۆمی فرمێسك ، تەزوەك بە لەشیدا داگەرا کچەش بو قورگیرانەوە لیێ پارایەوە :

بابەگیان دەبێ هەوڵی گواستنەم بدەی نەخۆواز لە ئیشەکەم دێنم ، ئەو سەد دینارەشم نەویست . تا ئێستا هەر چەندە موچەی دوو مانگم وەرگرتووە ، بەڵام پەنجا دینار زیاتر قەرزدارم ونە شمتوانی یەك فلس یارمەتیان بدەم کریی هاتوچۆ کردن نیوەی مووچەکەم رادەماڵی . ئیتر من لەم جۆرە ژینەو هاتوچۆی رۆژانە وەڕسم ، سەرماو سۆلیی ئەوزستانە ڤرەش هەر دوو قاچەکانمی تووشیی رۆماتیزم کردووەو لەئێش و ئازاریاندا دەناڵێنم ئەوەندی نەماوە لەرۆیشتن پەکم بخا بۆیێ بە دایکم گوت ، دەبێ رۆژی شەممە بچمە لای پزیشکیکی پسپۆر.

کچم ئەوەی گوتت هەموی وایە . بروات هەبێ من و دایکت شەوو رۆژ بیرو هۆشمان لای تۆیە ، هەر لەباسی تۆ دابوین . بەڵام لەسەرەتاوە پێم نەگوتی هاتوچۆکردنی رۆژانەت کارێکی سانا نییە؟ . . دێتەوە یادت رای سەرۆکی پشکینەرەکانی پەروەردەی شار هەر ئەوە بوو؟•

. . پێشەکی هەموو شتێکمان بۆروون کردیەدە ، باشتر نەبوو لەگەڵ دەستەخوشکە دەرس کارەکانت لە هەمان خانۆدا بمایتەوە؟ . .

وام هاتنە بەرچاو کە ئافرەتی چاك بوون ، جگە لەوەش کرێی ژوورەکەتان بەسەرتانا دابەش دەکراو هەرزان رادەوەستا دەبوونە چوار کەس ، هەر یەکە دە دینار شتێکی ئەوتۆ نییە . ئێ بەچاوی خۆت نەت دی ، ژوورەکە چەند تەنگەبەر بوو جیی سێ قەریوڵەکانی ئەوانی تێدا نە

دەبۆوە لەبەرچاوی تۆو خاوەن خانووەکە وا خۆیان نیشان دا کە قایلن، بەڵام هەرکـە ئێـوە چوونـە دەر دەمـوچـاویان لێ ترش کردم و لە یەکـەم شەوەوە یەکێکیـان خۆی پێ رانـەگیـراو لێم خەزری و هاواری کرد: «کەل و پەلم لە کوێ دانێم؟. لەکوێ دانیشم ئەوە حاڵ نییە ئێمەی تێداین؟». خۆ ئەگەر یەکێ لەوان بەهانا مەوە نەهاتیایە وە بەسەریدا بوم جۆرە نەی قیژاندبایە:

«شـەرم دادنـاگـرێ؟!.. ئا بەم جۆرە میـوانی یەکـەم شەومـان و دەستـە خوشکی تازەمـان پیشەوازی دەکەی؟!..

لەوانـە بوو فرێم داتـە دەرێ دوو شەو بەس لەگـەڵیان مامەوە، بەڵام ئەگـەر دەتـزانـی چۆنـم بردە سەر؟!.. خەو لە چاووم نەکـەوت دەرفـەتی ئەوەم نەبـوو خۆم بۆ گوتنـەوەی دەرسەکانی رۆژی داهـاتـو ئامـادە بکەم، چەند بازی و قژەقژ یان، دەنگی ریکـۆردو رادیـۆنیـان، گۆرانی و سەماکردنیان تا سعات سێی شەو، گـوێ کاس دەکـردم، ناچـار بووم ماڵەکە بەجێ بێڵم و بگـەرێمـەوە شار تا ئێستـاش رووم لەوێ نەکـردەوە تا کەل و پەلەکانم بگوێزمەوە.

تاوێ لە قسـەکردنا وەستا، سەرنجێکی وردی لە باوکی دا، ویستی بزانێ تا چ رادەیەك، قسەکانی کاری تێکردووە.

دیسان کەوتەوە قسەکردن:

دەزانی چییـان پێ دەگـوتم؟!.. «تـۆ کچێکی ئالۆزو چاو بەستـراوەی، هێشتا لە ژیان نەگەیشتووی چۆن دەبێ وەك مەر سەر لەئێواره بنوێی؟!».. لێم زویـر بوون، وای لێ هـات لە قوتـابخـانـەکـەش دا پشتیـان تێکـردم و رووی ترشیان پیشان دەدام، ئیتر چۆن بتوانم لە گەڵیاندا بمێنمەوە؟!.

باوکە تاوێ کەوتە بیرکردنەوە، پاشان لێی پرسی:

خۆ دەتـوانی لە ماڵێکی دیکـەدا ژوورێـك بۆ خۆت بەکرێ بگری؟ کچە بە روو گرژی‌یەوە وەڵامی دایەوە:

کچێکی نە شاەزایی وەکو من لە ژوورێك و بە تەنیا لەگەڵ ماڵێـك کە هیـچ ناسیاویمان لەگەڵیانا نەبووبێ، چۆن دەتوانم بحەوێمەوە؟!.. دەبێ خەڵك چیم پێ بلێن.. تۆ چۆن قایل دەبی؟.. خۆ خەڵکـەکـە لە هیچـەوە بەنـدو باڵورە بۆیەکتری هەڵدەبەستن.. گەلێ جار کە لە شەقامەکانی وێندەرێ دەرۆم، هینـدەی نامینێ قاچـەکانم هەڵخلیسکین ناوێرم سەرم بەرز کەمەوەو لە خەڵك رابمێنم، لە ترسی ئەو چاوانەی ئەووەتا هەڵم نالووش.

لەپـر پێکـەنی، لێـوە ناسکـەکانی لێك ترازان و دوو ریز لە ددانـە سپی وردیلەکـانی بە دەرکـەوتن دڵخـۆشی رەنگی ئاڵی خستە سەر روومەتی و دووبارە کەوتەوە قسەکردن:

جارێکیـان بۆ شتـومـەك کرین چوو بوومـە بازاری ئورزدی باکی وێنـدەرێ تاوێ بەرامبـەر بە ‌شی خواردنـەوە وەستـام، سـەیـری شووشـەکـانم دەکـرد، بەتـەمـای ئەوە بووم بوتلە وێسکیـەکت بۆ بکـرم لەگـەڵ فرۆشیـارەکـە کەوتمە مامڵەت، پیـاوێـك لەتـەنیشتم راوەستـابـوو، چاوێکی لەفـرۆشیـارەکـە تروکاندو بەدەنگێکی بەرزەوە پەلارێکی لێدام، «کچانی زانکۆ وەك پیـاو وێسکی دەخـۆنـەوە» لە سەرەتـادا شەرم دای‌گـرتم، بەڵام کە سەیـری فرۆشیـارەکەو چەند کەسێکی دیکەی نزیك راوەستـاوم کرد، تێـروانینـەکـانیـان وەك رم لە چاو دەچـەقێن، ئـاوورم لەپیـاوەکە دایەوەو بە تووڕەیی پێم گوت:.. «چۆنت زانی من وێسکی دەخـۆمـەوە، هەر لەبـەر ئەوەی پرسیـاری نرخییم کرد؟.. بۆ نابێ ئافرەت شتیکی وا بۆ باوکی یا برای یا بۆ خزمێکی بکرێ؟». پیاوەکە داوای لێبووردنی لێکردم و ئەوێی جێ هێشت و شەرمەزاریش لە نیوچەونیدا دەتکایەوە.

دایکە هەڵی دایێ:

پیـاوەکـە خۆ دەبینی کچـەکەمان لە چ بارێکدایە؟!.. بەو خوایـە گەر بێتـو بەهـانایەوە نەچی، وا دەکەم ئیشەکەی بەجێ بهێڵی و بگـەرێتـەوە لامان، ئەوچەند قرۆشەی ناویست.. ئا من چی دیکە ناتوانم بەم جۆرە بەرە للای بکەم.. تێدەگەی؟.

جا بۆخەتـای من دەگـریی؟.. هـەر پێش دووحەفتە نەبوو لەو کاتەی کە بەتەلیفۆن سکاڵای خۆی بۆ کردیی، پێم نەگوتی ئافـرەت بێ وەستـان برۆ، بەهـانـایەوە بکەوە، بزانە کچە لەچ لەبـارێکـدایـەوچۆن دەژیێ؟.. پێم نە گوتی بەبێ ئێمـە کاروبـاری خۆی پێ هەڵنـاسـوورێ؟.. بەڵام چیت لێبکـەم داتـە تەمبـەڵیی، هـەزارو یەك بیـانـووت هێنـایـەوە نەتویست

بچی . . پێم گوتی خەمی منت نەبێ ، دەتوانم خزمەتی خۆم بکەم ، جگە لەوەش پەروین جحێڵە ، تەمەن بیست ساڵەیە پاش چەند مانگێکی دیکە دەبێتە مامۆستای فێرگەی سەرەتایی لەبەرچی وەبێ نەتوانی کاروباری ماڵ هەڵسووڕێنێ ، یا بەلای کەمەوە خواردەمەنی خۆی ئامادە بکا؟! . . ئەی پێم ناڵێ چۆن شوو دەکاو ماڵێك بەڕیوە دەبا؟!

بەڵام من لۆمەی ئەو ناکەم ، بەڵکو خەتای تۆ دەگرم نەت توانی منداڵەکان وا فێرکەی پشت بە خۆیانەوە ببەستن و بتوانن گەر لە ئێمە دوور کەوتنەوە کاروباری خۆیان هەڵسووڕێنن . .

ئای لە تۆ؟ . . لە فرمێسك رژاندن و قرەقر کردن هیچی ترت لە دەست نایی؟ .

من ، یا تۆی دەربەست نایی ی گەر هاتو کچە لە ئەزموونی نیوەی ساڵیش بکەوی؟ . ئا من بە ئاشکرا دەڵێم ناتوانێ کاروباری ماڵ هەڵسووڕێنێ ، هێشتا قوتابی یە و پیی ی ناکرێ بارگرانی تۆ هەڵبگرێ . هەر لەبەر ئەوە بوو ماڵەکەم بەسەرو کۆکڵێدا بەجێ نەهێشت .

باوکە بە پەستی ئاوڕی لە (جوان)ی کچی دایەو وتی :

سەیری دایکت کە بڕوانە چ دەڵێ وچۆن بیر دەکاتەوە؟!

. . خۆ گومانت لەوەدا نەما کە هەر خۆی بوو نەیویست سەرت لی ێبدا؟ . . لیی ی بپرسە چەند هەوڵی ئەووم دا ویستم تیێ بگەێنم کە تو بە تەنیا چارەسەری گیرو گرفتەکانی خۆت پێ ناکرێ ، بەڵام لە قسە زیاتر هیچی تری پێ نییە هیچ عوزرێکیشی نییە پەروین نەبێ؟ .

ئاخر بۆیی ناوێرین قسەی دڵی خۆمانت پێ بڵێین؟ . . لە ئێوارەوە دێی و دەچی وگوێمان لێ دەگری ، ئەتەوێ بزانی دەربارەی چی گفتوگۆ دەکەین؟ . . بەڵام ئەوە باش دەزانین کە تۆ خۆت پێ راناگییرێ . لەبەر گرفتێکی بچووك هەڵدەچی و شرەشر دەکەی هەر فێری لۆمەمان بکەی . . وازمان لێ بێنە ، خۆمان کێشەی خۆمان چارە دەکەین ئەوە بڕیارم بە کچە دا پاش حەفتەیەك لە گەڕانەوەی بۆسەر ئیشەکەی بەدوایدا دەڕۆم و مانگێکی رەبەق جێت دێڵم ، ئەوجا دەتبینم لەچ بارێکدا دەبێ؟ .

هەستی پێکرد کە جارێکی دیکە ژنەکەی لیی ی توورەیە ، ئەوەش دەزانی کە هەر لەو کاتەی منداڵەکانی گەورە بوون ، گەلێ خوو رەوشتی گۆڕاوە ، ئەو ژنە سادەو ساویلکەیە نەماوە کە بتوانی وەك جاران بە ئاسانی جڵەوی بگرێتە دەست ، بە هێمنی و دەمار خاوی بەرامبەر شەپۆلی توورەبونو و لێشاوی جوێندان هاوار کردنی بەسەریا خۆی کپ بکا . . نایەتەوە یادی رۆژ ێ لەرۆژان وێرابێ بەرامبەری رابوەستێ ، هەر ئەو رەوشتەی بووەوای لێدەکرد کە بە هیچ جۆرێ دەستی لێ بەرنەبێ ، بگرە بە چاوێکی پڕ لە رێزەوە سەیری ئەو خۆبایە بێدەنگییەی ئەوی دەکرد ، کە هێمنیش دەبۆوە ، بەرامبەر تیر وانینەکانی پڕ لە لۆمەو گازاندە ، لە شەرمانا دەتوایەوە کە چاویشی بە لێشاوی فرمێسکی چاوی دەکەوت وەکو جۆگەلە بەسەر روخساریدا دەهاتە خوارێ و بەبێ دەنگی دەگریاو بە دەستە سرێکی سپی دەی سری یەوە ، ئەوا هەموو لەشی دەهاتە لەرزین و هەژانەوە ، هەڵچوونەکەی دادەمرکاو هەستی دەکرد کە ژیان قەت ژنێکی وا مەزن و دڵسۆزی نەخولقاندووە . . نموونەی ئافرەتێکی کوردەواری وەفادارە لەمێرد خۆشەویستن و خۆبەخت کردن لە پێناویدا هیچی تر نازانێ تا ئەو رادەیەی وازی لە کەسایەتی یە تایبەتیەکەی خۆی هێناوە . هەر ئەوەش بوو پالێ پێوە دەنا داوای لێبوردنی لێ بکا . هەستی بەوە دەکرد کە سەر لەنوێ دڵداریەکەی جارانی لەناخی دڵیدا چەکەرە دەکاتەوە ، لەیەکەم رۆژ ی بووك و زاواییان شەیدای دەبێ دەستی بەسەر پرچە درێژە رەنگە قاوەییەکەی دا دەهێنا ، قامکێکی دەگرتە دەست و لە لووتی نزیك دەکردەوە ، وەکو دەسکە گوڵێك بۆنی دەکرد . . وەیان ماچی گەرمی لە روومەت و نێوچەوان و گەردنە بلووریەکەی و چاوە گەشە رەنگە هەنگوینیەکانی و لێوە نەرموو ناسکەکانی دەکرد .

هەموو شتێکی دەکرد تا ئاشتی بکردبایەوە ، دڵی رازی بکردبا ، لەو زۆرداری یەو توورە بوونە شێتانەکەی خۆش ببایە . بەڵام ئێستاکە لای ئاشکرایە کە ژنەکەی وەکو جاران نەماوە ، تەنیا کەس نییە لەژیانی ، منالەکانی جێگای ئەویان گرتۆتەوە ،

ئەم هەستـەش لی‌ی ببـووە گری‌یـەك ئێشی پێـوە دەچێژت . . پیـاوە زۆردارە فەرمـان رەت نەکـراوەکەی جاران نەماوە، کە بە چریکـەیـەك مووچـرکی بە لەشـدا بروێنێ بۆییکـە زور جار مێشکی لە بیـرکـردنـەوەوە مانـدوو دەبـوو، دەیان جار لە خۆی دەپـرسیی رەوشتی خێـزانـەکـەی چۆن بەم شێـوەیە گۆڕا چۆن توانی منالەکانی بەم جۆرە بۆ لای خۆی رابکێشێ و بیانکات بە بەشێـك لە خۆی؟! . کە ئەو روخسـاری خەندەی پێوەبێ ئەوە منـدالـەکـان کەیف خۆشی دایان دەگرێ وەکو خونچەی بەهار دەگـەشێنـەوە بەلام ئەگـەر هاتوو خەمباریان پێوە دی وەك بازنە دەورەی دەدەن و بە غەمگینی بەرامبـەری هەلـدەتورکێن . هەر جارێ لەیـەك تۆرابن منـالـەکـان لەو دوور کەوتـوونـەتـەوەو لایـەنگیـری دایکیـان کردووە، بگرە چەند رۆژێکیش قسەیان لەگـەل نە کردووە، ئەگـەر ئاوڕیشیـان لێـدابێتـەوە، ئەوا بە چاوێکی پڕ لە ترس و گازاندەو لۆمە سەیریان کردووە. هەستی بەوە دەکرد منالەکانی بەردەوام لایەنگیری دایکیان دەکەن بەبێ ئەوەی بزانن ئەو کێشـەیـەی لەسـەر تێکچوون چییە؟! . گەلێ جار لێیانی دەپرسی :- «رۆلە بۆ وا دەکەن؟!»

وەلامیان دە دایەوە :-«ئێمە هەر لەگەل دایکمانین».

:- بەلام لەبەرچی خۆتان ماندوو ناکەن تا بزانن لەبەر چی تێکچووین و هۆی زویر بوونمان لەیەك چییە؟!

بەلێ بابـا، ئێمـە بروامـان وایـە، دایکمـان ژنێکی چاکـە مەزنتـرین ئافـرەتـەو چاکتـرین دایەیە لەسەر رووی ئەم زەمینە بۆیی ئیمە لەگەل ئەوین ناشتوانین وا نەبین.

پەیـوەنـدی لەگەل منالەکانی ئا بەم جۆرە بوو. هەر ئەوەش بوو خستبوویە ناو گیروگرفت و کێشەیەکی بەردەوام لە گەلیانا . .

مەزنـدەی وا بوو کە سەرکێش و لاسـارن، لەوەتی گەورە بوون رەچـاوی بابـەتیشی ناکـەن. بەلام لە ئەنجـامـدا سەرە پەتـەکـەی دۆزیـەوە، بۆی دیـار کەوت کە خەتـا لە خۆیەتی، ئەویی کە ئەم هەمـوو خۆشـەویستییـەی وانی لەقوولایی دل و دەروونـیـدا ئاخنـیـوە، سالانی تەمـەنی بۆبەخێـوکـردن دابین کردنی پاشە رۆژی وانی تەرخان کردووە چۆن نەبتوانیوە بەلای خویـدا رایان بکێشێ و هەست بەم هەمو دلـسۆزیەی ئەو بکـەن؟! . . بۆیـی هاتـە سەر ئەو باوەڕە کە دەبـێ شێـوەی پەیـوەنـدی لە گەلیاندا بگۆڕێ وەك جاران منال نەماوون تا بێ سێ‌ودوو بۆ فەرمـانی ئەو مل کەچ بکـەن، ئەوانیش دەیـانەوێ باوك تێیـان بگـاو گوێ لە خەفـەت و گیـروگـرفتی رۆژانـەیان بگـرێ، بۆیێ ناچـار بوو رەفتـارێکی نوێ لەگەلیانا پەیرەو بکا ئیتـر لەو رۆژەوە ئەوانیش گۆران و لیێ نزیـك کەوتنـەوە بۆیـان روون بۆوە کچ باوکیش پێویستی بە ئاگالێبون و خوشەویستی و دلسـوزی مندالەکانی هەیە گەلێ جار پێی دەگوتن :- «نامەوێ هەر لایـەنگیـری من بکەن یا بەس منتان خۆش بوێ. . نا من هیـچ ئەووم ناوێ ، بـەلکو زۆرم پێخۆشە خۆشەویستیتان بەبێ جیاوازی لە نێوان من و دایکتان دابەش بکەن گەر هاتوو لەیەك تۆراین خۆتـان بکـەنـە ناوبژیکەر . ئێمە هیچ گیروگرفتێکی ئەو تۆمان نییە لەسەری بتۆرێن ، گیروگرفتی ئێوە نەبێ، جا وا باشە لەسەر حەق برۆن. . تێدەگەن؟! . »

وێستی ژنەکەی هێمن بکاتەوە ، لیێ‌نزیك کەوتەوەو پێی گوت :

دایکی جوان توورە مەبـە دلخـۆشی ئەو ئاهەنگەی ئەمرۆ بۆ جوانمـان گێرا، مەی‌کە بە پەلە هەورێکی خەمباریی و رۆژمان لێ تاریـك مەکـە. هاتـنـەوەی جوان بوو ئەو دەرفـەتـە دلخـۆشکـەرەوەیـەی بۆ رەخسـاندین. ئەو هەموو خەلکەی لە دەورە کۆ کردینـەوە. . خوشکـەکـانت و مێـردو منـالـەکانیان، گشت کەس و کاروناسیـاوان، بە دیـدەنی هەمـوویـان شاد بووین تێـرمـان لە خواردە مەنیـە بەتام چێژانەی سازت دابوو، خواردو زۆریش پێکـەنین و گەشـاینـەوە، ئەوخەفـەتە رەشەی دووری جوانیشمـان بە با دا گوێشمان نەدایە چریکەو قیژەی منـالان، هەر چەنـدە تۆ دەتـرسایی دەمارەکانم بگیرێ و توورە ببـم. . ئای ئەگـەر دەتـزانی تاچ رادەیی کەیف خۆشی دای گرتبـووم؟! . . لە دلی خۆمـدا دەمگـوت ئەوە منم ئەم رۆژە دەبینم؟ . . بەم جۆرە کچی نۆبەرم گەورە ببێ و بەرەو کانگەی ژیـانـەوە بە فرەوانتـرین دەروازە تێپـەر ببێ. . بێ بە مرۆڤێکی نوێ بەردێکی تازە بخاتە سەر تەلاری ئەم ژیانە؟

بەڵام ژنـە نقـەی لێـوە نەهات نیشانەی توورە بوون هێشتا روخسـاری بەرنەدا بوو مێردە لە جیگاکەی قیت بۆوەو لە تەکی دانیشت، دەستێکی خستە سەر شانی و ویستی دڵی بداتەوە:

گوڵشن گییـان چییـە لێم زوێر بووی؟!.. دە پێکەنە حەز ناکـەم بە رووگـرژی بتبینم، چونکە پێکەنین وەك تیشکی رۆژ روخسـارت دەگـەشێنیتەوە.. دەزانی ئەمرۆ زۆر شوخ شەنگ دیار بووی، لە کچی چواردە ساڵی جوانتر دەهاتیە بەرچاوم.. گوڵی ئاهـەنگەکە بووی، بە کراسە شینە ئاسمانیەکەو سوخمە گوڵ گوڵیـەکەی بەرت و ملوانەکەی گەردەنت و بازنە زیرەکانی دەستت و رەنگـە ئاڵـەکـەی سەر گۆنـات، بـووی بە بوکێکی جوانتـر لەو رۆژەی بە دیـدەنـت حەپـەسـا بووم تریقـەی پێکەنینەکەت ئاوازی خۆشترین گۆرانی بوو بەبەر گوێمدا دەهات.

.. ئای ئەگەر دەتزانی بیرم لەچی دەکردەوە؟!.

ژنە خەندەیەکی جوان روخساری گەشاندەوە:

ئادەزانم بیـرت لەچی دەکـردەوە؟.. پیاوان تەمەنیان بگاتە سەد ساڵیش ئەوەیان هەر لەبیرە!.

مێردە دایە قاقای پێکەنین، بە دەنگێکی بەرزەوە دەی گوت.

وەاللاهی زیرەکیی باشت زانی.

پاشان ئاورێکی لە جوانی کچی دایەوە وگوتی.

دەی کچم هەڵسن وەرنـە هۆڵـەکە، لەوێ قسەکانمان تەواو دەکـەین، ئەگـەر هاتوو بەرنامەی تەلەفزیۆنتان بەدڵ نەبوو ئەوا ڤیدیۆتان بەکار دەخەم.. بە بۆنەی هاتنەوەت، دڵشادی برات چەنـد کاسێتیکی لای برادەرانی بۆ هێنـاوین، من خۆم حەزی لێ ناکـەم، چونکـە زوربـەیـان فیلمی چەتەگەری و کاوبۆیی و دەمـانـچـە بەدەسـتـی ئەمـریـکـایـیـن بەڵام چەنـد گۆرانی یەکی کوردی خۆشم تۆمار کردووە، ئەگەر دلتان گرتی، بۆتانی ئیش پێدەکەم.

بەرەو مێـزەکەوە چۆوە، پاشماوەی پەرداخەکەی بە یەك جار هەڵی لوشی، کەمێـك سر بوون بە لەشیـدا داگـەرا، حەزی کرد گوێی لە گورانی یەك راگرێ، کاسێتی «شیرین بەهارەی» خستە ناو ریکۆردەکەوە تاوێ گوێی راگرت، لەبەر خۆیەوە گوتی:

«بەلکو قسەیان پێ دەبرم». دووبارە زۆری لێکردن، ناچار لەگەڵیا چوونە هۆڵەکە.

ئا بەم جۆرە پێبکەنن، روو گرژ مەبن برواتان هەبێ کزیو غەمگینیی و بێ ئارامی چارەی هیـچ گرفتێـك ناکـەن و هیـچ کۆسـپـێکیش لەبـەردەم مرۆڤ وەلا نابـەن.. کچم دەبێ بە جەرگ قایمی و زیـرەکیی خۆت روو بەرووی گیـروگرفتە کانی ژیـان ببیـەوە ئەزانم ئەوە سانـا نییە ئێمە هەموومان لە سەرەتادا وەك دەشێـواین، نەدەوێـراین خۆمـان فرێ دەینـە سەر شەپـۆلی ژیـان، چونکـە ژیـان وەك دەریـایێکی بێ بن و فرەوانە، دڵی تازە مەلـەوانکـەر دەلـەرزێنێ، بەڵام کە خۆت هاوێشتـە ناو گیـژاوی شەپـۆلـەکانی، بە ئاسانی لەگەڵ خۆیا هەڵتدەگرێ، هەستی ترس و لەرزەی دڵت وەکو هەڵم پەرش و بڵاو دەبێتەوە.

لەپـر زەنگـەکـەی نێـو ماڵ ترنگـەی لێوە هات. باوکە لە قسـەکردنا وەستا چاوێکی بە کاتژمێرەکەی سەر تەلەفزیونەکەدا خشاند سعات نۆی شەوە، ئەبێ بەو درەنگییە کێ بێ؟!.

.. نـازانم ئەو دوو هەتیـوە بۆ کوێ چوون؟!.. لـەئێوارەوە بزرن، کچم پەروین دەبـرۆ بزانـە ئەوانن، دەتـرسم دەرگـای دەرەوە گاڵە درابێ؟.

لە هەمـان کاتیشـدا موسیقـا تایبـەتیەکەی پێش دەرخستنی وێنەکانی جەنگ، لێدرا، چاویان بڕییە پەردەی تەلەفزیۆنەکە، دەنگە قەبەکەی پەخشەرەکە ـ مذیع ـ بەرز بۆوەو سەرنجیانی راکێشـا، وێنـەی سەدەهـا کوڕ راوی دوژمن بەدوای یەکـدا دەچـوون، کـە لەشی وەك بێـژنـگ کون کراو دەیـەها لینگ و سەرو باسك قۆلی پەریو بەم لاو ئەولادا پەرش و بڵاوبۆوە.. دەیەها تانك و زرێ پۆش و ئوتومبیل بەمووشەك و گوللە تۆپ، شەق و پەق کرابـوو دووکـەڵیـان لێ بەرز دەبـۆوە، هینـدێکی دیکـەش بە ساغی ریـز کرابـوون، لە لایـەکی دیکەشەوە، بە هەزارەها تفەنگ و ئاربی جی و تۆپ و رەشاش و بەبار جبەخانە هەڵدرابۆوە..

تابـووری بەدیـل گیـراوانی ئێـرانی بەجـل وبەرگـە شڕو شیتاڵەکانیان ڕێچکەیان بەست . بوو، دەخرانە ئوتومبیلەکانی سەربازی، تا بۆ پشتەوەی بەرەی جەنگ بیانگوێزنەوە.

پەخشەرەکەش دەیوت :

« . . ئـا بەم جۆرە دوژمنـان تەفروتونا دەکەین ئەوەی بوێری پای بخـاتـە سەر بستێ زەوی نیشتمانەکەمان دۆزەخ بە چاوی خۆی دەبینێ . . بە هیچ جورێ لە مردن و سوتاندن دەرباز نابێ

. . ئـا بەم جۆرە پاڵـەوانان، جەنگاوەرانی عیراقی بەرگری لە نیشتمانە کەمان دەکەن و سنوور دەپارێزن . »

ژنەکەی موچرکێکی بەلەشدا داگەڕاو ڕووی بەو لادا وەرگێرا :

ئای لەم بێ ویـژدانـانە، تا ئەم رادەیە مرۆ لایان بێ نرخە، دایك تا منالێك گەورە دەکا چاوی سپی ئەبێ، ئا ئەوانیش بەم جۆرە دەیان دەن بە کوشت؟ . . چۆن ئیسلامیکن ئەو شەڕە بۆ ڕاناگرن؟! پیاوەش هەڵی ی دایێ وگوتی :

ئەوانن شەڕ ڕانـاگـرن، کەللە ڕەقن وگوێ لە قسەی کەس ڕاناگرن . کەس نەما پێیان نەڵێ و داوای ئاشتی و شەڕ ڕاگرتنیان لێ نەکا . . ئەزانی لەبەر چی نایەنەوێ ئەم شەڕە ڕابگرن؟ .

بە خەیـاڵی ئەوە دەژین ولاتـەکـەمـان بخـەنـە ژێـر زەبـرو زەنگیـان وەکـو گەلەکانی خۆیان تۆپ تۆپانێمان پێ بکەن . . گەر یەکێ دوو قسـەی لەدەم هاتــە دەرو بە دڵی وان نەبــوو، زمـانی ببـرن و لە گۆرەپـان و سەر شەقـامـەکاندا لەسێ دارەی بدەن، یا لە بەنـدیخـانەو ژێر زەمینەکانیان کەوڵی بکەن، هەر وەکو ئەوە لەگەڵ گەلانی خۆیان دەکەن و بە بیانووی ئەم شەڕە دەیانەوێ کەس سەر لە پێستی خۆی نەهێنێتە دەر.

لەپڕ پەروین خۆی کوتایە ژووری و قسەکەی باوکی بری :

ئای لەو سەرمایە .

باوکی تێ ڕاما، کچە ڕوخسارو هەردوو دەستەکانی گرژ ببوونەوە .

خۆ باران نییە؟

نا بابـا، بـەڵام ئاسمان ڕەش داگەڕاوەو بایەکی وەکو زریان دێ، دەست و پل سڕ دەکا وڕوخساریی دەتەزێنێ لەوانەیە نیوە شەو بباریێ .

ـکێ بوو؟

ـ برادەرەکەی دڵشاد بوو، لەوی دەپرسی .

باوکە دووبارە ڕووی لە جوانی کچی کردوویستی قسەکەی پێشووی تەواو بکا :

خۆ ئەم وێنـانـەت دی؟ . . بـزانـە چ جۆرە کارەساتێك لەم جیهـانـەدا هەیـە . . ئەوەی تۆ گرفتی پێناڵێن! . دەباری خۆت بەراوورد بکـە لەگـەڵ ئەوانـەی شەوو ڕۆژ لە سەنگەرەکانیاندا ئێشك دەگرن، نازانن لە چ کاتێکدا دەبنە قۆچی قوربانی ئەم نیشتمـانــە؟ . . ئەو ساکــە دەزانی کە گرفتـەکـانی تۆ هیـچ نییــە؟! . . کـچم مرۆڤ بێ گرفت نابێ . دەبێ ئەوە بزانی تا مردن برۆکت بەر نادا، وەکو سێبەرێ لێت جیاواز نابێتەوە تا ئەو دونیایە جێ نەهێڵێ بەڵام هیچ کێشەیەك نییە چارە نەکرێ .

زەنگی تەلـەفـۆنـەکـە قسـەکـەی پێ بڕی . پەروین گوێ پێگرەکەی هەڵگرت و بە توورەییەوە دایناوە جێگاکەی خۆی . .

«خۆ وەڕسیان کردین، ڕۆژ نییە دە جار لێ نەداو کەسیش وەڵام ناداتەوە . »

باوکـەش چاوی بە نیشـانـەی دڵخـۆشی کەوت دەپـرژێتـە ڕوخســـاری جوان گلێنــەی دوو چاوەکــانی فرەوان دەبن و تیـشـکـێـکـی بریـسـقــەداری لێ دێتــەدەر، ڕەنگــە زەردو هەڵگـەڕاوەکەی سوور دا دەگەرێ ، لێوە ناسکەکانی نەخشەی زەردەخەنەیەکی منداڵانەی دڵخۆشکەرەوەی دەکێشێ .

بابـەگیـان قسەو ئامۆژگاریەکانت هەموو خەم وپەژارەی لە دڵمی هێنـایە دەر بەڵام من تووشی کێشەیەکی دیکە هاتووم، نازانم چۆن لیێ ی دەرباز ببم؟! .

باوکە واق وڕمانەوە سەرنجی دایێ

کچە بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی :

کێشـەی زمـانـە . . بە چاکی ناتـوانم دەرسەکان بەکوردی بڵێمەوە خۆت ئەوە دەزانی کە من بەدرێژایی پلەکانی خوێندم بەزمـانی عارەبیم خوێنـدوە، بەو زمـانە فێری زارەوەکانی بووم بەڵام ئێستـا لەو فێرگەیەی لیێ دامەزراووم زۆربەی دەرسەکان

به زمــانی کوردی تیـْدا دەگـوتـرێتـەوە، بەتـایبـەتی دەرسـی بایـولـۆجی، کە بە شەکـەی منە خۆشت دەزانی کوردییەکەی من شەق و پەقـە بیی ناچـار دەبم پەنـا بەرمـە بەر عارەبیـەکە، بەلاّم وادیـاره قوتـابیـەکـان دەیـانـەوێ تاوانی تەمبـەڵی و خۆدزینـەوەیـان لەدەرسـەکـان، بخەنە ئەستۆی من جارێکیان یەکێکیانم هەڵسان، ویستم تاقی بکەمەوە، چەند پرسیارێکم لێکـرد، بەلاّم لاڵ وەستـاو هیچی نەزانی، منیش سەرزەنشتم کرد. ئەی ئەگـەر دەت دی چۆن بە رووم تەقییـەوە خۆی لیٚ گیف کردمـەوەو بە تووڕیی هاواری کرد «کـە تۆ نە توانی بەو زمـانەی من تیٚ ی دەگەم دەرسەکەم بۆ راڤــە بکــەی، چۆن بتـوانم تیٚ ی بگـەم و بەرەوایی وەلاّمت بدەمـەوە؟». ویستم تیٚیـان بگـەیێنم کە هاوکاری کردن لەگەڵ یەکتـرا هۆیـەکی سەرەکی یـە بۆچارەکـردنی ئەو کێشەیە.. بە ئاشکرا پیٚم گوتن کە کوردی یەکەم لاوازە تا بەسەر ئەو کێشەیە زاڵ دەبم دەبیٚ ئێوەش یارمەتیم بدەن، خۆتان ماندوو بکەن لەو بروایـەش دام کە زۆربـەتـان عارەبی دەزانن، ئەگـەر وا نەبیٚ چۆن دەرسـەکـانی بەو زمـانـە دەگـوتـرێتەوە تیٚ دەگەن؟!.. دەزانم هێنـدێکییـان لاسـارن ویـەڵپم پیٚدەگرن، بەلاّم چییان لەگـەڵ بکـەم زۆربـەیـان، بەتـایبـەتی ئەوانەی پۆلی شەشەم کوری گەورەی بەریش و سمیـڵن، هێنـدەکشیـان بە ژن و منـداڵن ئافـرەت شەرمیـان لیٚـدەکـا ئەوانـە بە پیـاو نەبیٚ راگیر نابن.. نازانم چۆن ئەم کچـە جحێـلانـەیان تێکەلاّوی ئەمانە کردووە؟!.. ئێمـە لە ئاورپـادا نازین.. والـلاهی بابـەگیان زۆرم پیٚناخۆشە لەم فێرگەیە دەرس بلێمەوە. بۆ من فێرگەیەکی تایبەت بە ئافرەت چێترە.

کچم دەبـوایـە ئەم کێشەیانەت بخستایەتە بەردەم کارگێری فێـرگـەکـە من دەزانم تۆشارەزای بەشـەکەی خۆتی، حەزیش ناکـەم لەبـەر لاوازی زمـانـەکـەت مەزنـدەیەکی ناراستت لیٚ وەربگیـریٚ کێشەی کورەکانیش وەك دەڵیٚ ی وایە، بەلاّم لییّان دلگیر مەبە لەوانەیە هێندەکیان تیٚ نەگەن.

هەمــوو شتـێـکـم بۆکارگێـر روون کردۆتــەوە، بەلاّم گواستنــەوەی من بەدەست ئەو نییــە ئەو دەڵیٚ ی ئەگــەر بێتـو دەرسکـارێکی پسپـوور نەنێرنە جیگاکەی من، بە گواستنە وەم قایل نابیٚ،

جا من ئەوەی لە کویٚ بۆ پەیدا کەم؟!.

باوکە بە پرۆشەوە گوتی:

بەراستی ئەم کێشـەیـەت لە هەمـوو کێشەکانی تری باست کردن گرنـگ وزەحمـەت ترە. چونکـە تەنیا خۆت ناگرێتەوە وزیـان هەر بەخـۆت ناگـەیەنیٚ، کە لەوانەیە بەبیٚ حەق لەبەر چاوی قوتـابیــان و مامــۆستـایــان، بە نەزان و ناشـارەزای دەرسـەکـەت دابنـدریٚی بەڵکو زیانیش بە قوتابیان و کاروباری فێـرکـردن و رۆشنبیـریش دەکـەیەنیٚ من لەسەرەتاوە بۆم روون کردیــەوە کە زمــان زانـین شتێکی گرنــگ و سەرەکیـیــە بۆ دەرس گوتنـەوە ئەوەی زمـانـەکـەی بە رێـك و پێکی نەزانێت ناتـوانی بە درووستی و سانـایی دەرسەکەی بڵێتەوەو قوتابیانیش بە چاکیی لیٚ ی ناگــەن.. زمــان نە هەر ریگــای دەربــرین و قسەپێکردنە، بەلکو ریگای بیرکردنەوەشە. بەلاّم هەقی تۆشە، گلەییت لیٚ نـاکـەم، هێشتـا پییٚ ی رانەهاتووی. دەتۆش زیاتر خۆت مانـدوو بکـە، پەنـا بەرە بەر دەستـە خوشکەکانت، لەم باوەڕدام پاش ماوەیـەکی کەم باش دەبی رێگـامـەدە قوتـابیـان گاڵتـەت پێبکـەن و توانجت تیٚ بگـرن و پیٚت بڵێن زمـانەکەی خۆی نازانیٚ!

بۆچــی من خۆم مانــدوو نەکــردووە؟!.. بڕوات هەبیٚ زووربــەی کاتم بە خوێنــدنــەوەو پێــداچــوونــەوەی کتێبـە کوردییـەکـان دەچۆێنم، وەکو قوتابیان دەرسەکەو زارەوەکانی بەکـوردی ئەزبـەر دەکـەم بەلاّم بۆمن ئەمـە کارێکی یەکجـار گران و زەحمـەتـە رۆژ نییـە سەد جار نەفـرەت لەخـۆم نەکەم و گەلیٚ جاریش لەداخـا بە کوڵ نەگـریم دەیـوایـە فێـرگـەیەکی عەرەبیم بۆخۆ هەڵبژاردایە.

وەڵلاهی کچم لەمە زیاتر هیچی ترم لەدەست نەهات، بەر پسیــاری پەروەردەی شار نەمـا پییٚ نەڵیم، بەلاّم گوتیـان «بـۆ یەکــەم جار ناکـریٚ لەشـار دابمـەزریٚ بریـارێکـەودەرچـووە هـیـچیش بە دەست ئێمــە نییــە» خۆشت قایـل نەبــووی لە فێرگەیەکی دووری شار دابمەزرێی، لەوانەی دەرسی عارەبی

تێدا دەگوترێتەوە خۆمنیش لەسەر رایەکەی تۆبۆکە فێرگەیەکی کچــان و دەرس گوتنـــەوە بەوزمـــانـــەی شارەزایــت و پێ ی راهاتووی ، بۆ تۆ چاکتر بوو . . بەڵام ئێستا ئەوا دوو مانگە لەم فێرگەیە دەرس دەڵێیتەوە دەبوایە زمانەکەت لە جاران باشتر بوایە .

کچە بە پەستی وەڵامی دایەوە :

جا کێ دەڵێ لە جاران باشتــر نیم؟ ! . بەڵام ئەوەی راست بێ هێشتـــا زۆرم ماوە بتـــوانم بە ئاســانی و رەوایی دەرسی پێ بڵێمــەوە ، بۆیــەش دەفتــەرەکانی ئەزمونم لەگەڵ خۆمدا هێناوە بەلکو لێرە تۆ یارمەتیم بدەی .

باوکــە دەفتــەرێکی لەدەست وەرگـرت و چەند پەرێکی لێ هەڵدایەوەو بەبێ دەنگی دەی خوێندەوە .

ئای کە خەتێکی ناخۆشە؟ . . بەبێ چاویلکە زەحمەت بۆم بخوێندرێتەوە ! .

دەفتــەرەکــەی دایــەوە دەستی و داوای لێکرد بۆی بخوێنێتەوە مەبەسیشی تاقی کردنەوەی زمانەکەی بوو . گوێی لێ راگرت و بزەیــەك بەسەر لێــوانیدا داگەرا ، بەکەیف خۆشییەوە هاواری کرد ئافــەرین . . ئافــەرین کچم بەخــوا زۆر پێشکــەوتــووی ، نازانم بۆ وا کێشــەکــەت زاڵ کردوە؟ . . ئەی پێم نەگــوتی بە ماندوو بوونێکی کەم بەسەری زاڵ دەبێ . . خۆزاراوە کانیشت هەمووی لەبەرە ، جا پێم ناڵێ ی یارمەتی چیت بدەم؟ ! .

بە پەنجە چەناگەی خوراندو پێی گوت :

نا . . نـا . . زۆر باش بوی بەڵام ئاگــادار بە بە خۆرایی نمرە بەسەر قوتابیاندا دابەش مەکە .

من ؟ ! . . خۆ هەر لە ئێستاوە بە دەستمەوە دادە دادیانە قەت لێ نـاگــەرێم قوتــابی تەمبەڵ بە بێ حەق لە دەرسەکانم باز بدا بەڵام ئەوانــەی خۆیان ماندوو دەکەن و دەیانەوێ بەراستی فێر بین ، یارمـــەتیـان دەدەم ، هیچیشی تێـدا نییــە ئەگــەر هاتــوو بۆ هاندانیان چەند نمرەیەکم بۆ زیاد کردن . . بەڵام پێم ناڵێ ی بۆ دەتــەوێ قســەکــە بەلایــەکی دیکەدا بەی؟ . . خۆمن سوورم لەســەر گواستنەوەم بۆ شار من بە ئاشکرا دەیلێم بێتو چارەیەك نەکەی ، وەك لەپێشودا گوتم کارەکە جێ دەهێڵم و دەگەرێمەوە لاتان و لەماڵ دادەنیشم ئیترکەیفی خۆتانە .

باوکە ویستی دڵی بداتەوە :

خەمــت نەبــێ ، ئەوەی لەدەستم بێ ئەی کــەم . بەڵام تا پشـــووی دوایی ساڵ ئارام بگــرە من وای بەبــاش دەزانم دوای گەرانەوەت لە ماڵێکی ناسیاوژ ووریکت بۆ بەکرێ بگرین ، تا لە هاتـــووچـــۆ کردنی رۆژانـــە رزگــارت ببێ ، پاشــان هەوڵی گواستنـــەوەت بۆ شار دەدەین . ئەگــەر هاتــو بۆمــان نەکــرا ئەوە داوای گواستنــەوەت دەکــەین بۆ هەر فێرگەیەکی دیکە کە تێدا بتــوانی پسپــۆری خۆت بە چاکی بخــەیتــە خزمــەت گوزاری قوتابیان ، گوێش مەدەرە دوورو نزیکی جێگــاکە کچم خۆت بە شتی بچـــووك مەشغــووڵ مەکــە ئەوەی پایــەی مرۆڤ لای کەسانی تر بەرز دەکاتەوە ، ئەرکی سەرشانی خۆی بە دلسۆزی ببــاتـــە سەر سوود بە خەڵکی ببــەخشێ ئەوساکــە هەست بە دڵخـــۆشی دەکـــەی . . هەستی سەرکـــەوتن کامــەرانیت پێ دەبـــەخشێ پر بەدڵ بە ژیــان پێــدەکــەنی و روخســارت کزیو غەمباری نابینێ .

تاوێ وەستــا ، بــەتێــروانینــەکــانی روخســاری کچــەکــەی پشکنیەوەو لێ ی پرسی :

رات لە قسەکەمە؟

زۆر

کەواتــە دوای بەســەرچــوونی ئەوچەند رۆژە ، دەگەرێیەوە قوتــابخانەکەت ، من و دایکیشت لە گەڵتا دێین و جێت ناێلین تا گشت گرفتەکانت چارە نەکەین . . هە..قایلیی ؟



بەروخسارێکی گەشەوە ووتی :

چۆن قایل نابم ئەی چاکترین بابە.

باوکە بە پێکەنینەوە :

بەڵام زمانەکەت لەبیر نەکەی. دەبێ ئەوە بزانی ئەگەر هاتو هەزارو یەك زمانی دیکە بزانی ، بەڵام کە شارەزای زمانە زگماکەکەی خۆت نەبووی‌و بە چاکی و رەوانی نەت توانی پێی بنووسی‌و بخوێنیەوەو قسەی پێ بکەی، ئەوا کەلێنێکی فرەوان دەخەیتە نێو زانین و زانیاریت. . دوا ئامۆژگاریشم ئەوەیە، کەمتەرخەمی لە فێرکردن و پەروەردەکرنی قوتابیەکانت نەکەی چونکە ئەوانن کۆڵەکەی دوا رۆژ.

لەپڕ کچەکەی لەجێگاکەی هەڵساو لە پشترا بازووی لە ملی ئاڵاند، ماچێکی لە روومەتە توکاوی‌یەکەی کرد، پاشان لەتەکی دانیشت وەکو سەردەمی منداڵەتی خۆی پێوە نووساند باوکەش دەستی بەسەر قژە درێژە رەنگ قاوی‌یەکەی داهێناو، نێو چەوانی ماچ کرد. . خۆی پێ‌رانەگیرا نەی‌زانی لەبەرچی لێشاوی فرمێسك لە چاوەکانی دەرپەری لەسەر رووومەتیدا رێچکەی بەست هەستی بە بوومە لەرزەیەك کرد قوولایی دەروونی دەهەژێنێتەوەو لافاوی سۆزی وەکو کڵپەی بورکانێکی تەقیو دەردەپەرێنێتە دەرێ نایەتەوە یادی قەت تووشی حاڵەتێکی وا هاتبێ.

لەپڕ دایە قاقای پێکەنین پەرداخەکەی بەرز کردەوە قومێکی لێداو بە دەنگێکی بەرزەو ووتی :

برۆ ئەی خەفەت هەزارو یەك بەردت لەدوا بچی‌و گەرانەوەت نەبێ.

ژن و کچەکەیشی لە گەڵیا دایانە قاقای پێکەنینێکی دوورو درێژی دڵخۆشکەرەوە.

# خەونەکان سەوزدەبن

ئارامی کاکەی فەللاح



شەوێك لەشەوەکانی پاییز لەژ ورێکی زۆر بێدەنگ دا زریان لەسەر جێگاکەی پاڵ کەوتووەو بەسەرنجێکی تیژەوە هەردووەدەستی لەژێر چەناگەی داناوەو لەبیرێکی زۆر قوڵ و دوودڵی یەکی گەورەدا حەپە ساوەو بێزاری یەکی زۆر هێمن لە چاوە کانیدا هاتوچۆ دەکات و بەرزونزم دەبێتەوە، لەلایەوە چیای هاوڕێ بەسەرسامی سەرنجی لەزریان داوەودەیەوێ قسەنەکات و هاوڕێکەی لەوبیرە قوڵەنەکات، لەپڕ لەساتێکی بریندار‌دا زریان هەردوو دەستی لەسەر دەموچاودا دەنێت و بە دەنگێکی گڕولاوازەوە

**- خۆزگە ئەم شەو خەوەکەم ببینیایە**

**- خەوی چی زریان**

**- ئەوخەوەی وابێزاری کردوم و نامگەیەنێتە ئەنجام**

**- کام ئەنجام**

**- ئەو ئەنجامەی خۆم دەمەوێ بیگەمێ**

**- من هیچ لە تۆ حاڵی نەبووم**

بەم هەورازە دڕکاوی یەدا وەك بەچکە چۆلەکەیەك بەملێکی لاوازەوە سەرو لەشێکی زۆر گەورەمان هەڵگرتووەو ملی ڕێگایەکی زۆر سەخت و درێژمان گرتووەو ناگەینە ئەنجام یان جارێکی تروەکو کونەپەپوباڵی ڕاستمان ئەدەین بە باڵی چەپداو دەنگێکی گەورەو ناخۆشەوە گۆرانی بێ ئاواز دەڵێین و مرۆڤ بێزار دەکەین بەڵێ مرۆڤ لەم سەردەمەدا بەزۆرشت بێزار دەبێت هەندێ جارمافی خۆشی نیە بەڵێ زریان وایە ،بەڵام تۆقسەکە مەگۆڕە بزانم ئەو خەوەی بێزاری کردوی چی یە.



چیا گیان دووسێ شەوە هەندێ خەوی زۆر ئاڵۆزو چزودارم بینیوە هەردەمەوێ لەبیر خۆمی بەرمەوە بەڵام ناتوانم .

- دیارە خۆت ناتەوێ لەبیرت بچێتەوە ئەگینازوو لەبیرت ئەچووەوە ، چونکە مرۆڤ ئەوشتەی کە بیەوێ بیری بچێتەوە باش ئەتوانێ بەلای خۆیدا لابات ، بەڵام ئەوەی کە مرۆڤی پێ ئازار داوەو لەناوەوە جێی شارەزەردە واڵەیە پێویستە هەمیشە لەیادی بێت بەڵام بزانم چیت بینیوە چیاگیان پێری لەخەوما هەندێکی زۆر لەخەڵکی ئەم شارە بوو بوون بە ئەکتەرو لە سەرشانۆیەکی رووخاوو لێ قەوماو دەوریان دەبینی بەڵام ئەوەی سەیربوو هەندێکیان سێ دەوری جیایان پێ درابوو ، چەندجارێك بەبینەرە کانمان ووت کەگوایە ئەکتەرمان کەمەوە بەڵکو یارمەتیمان بەن لە گێرانی دەوری یەکەم لەسێ دەوری شانوگەری یەکە هەندێکیان هاتن و ووتیان دەوری یەکەممان بۆ لەبەرناکرێت زۆر قورسە ئەگەر هەیە دوودەورەکەی‌تر، بەشی یەکەم دارگوێزێکی زۆر گەورەو بە ساڵا چو زۆر لەسەرخۆو بەهێمنی ئەیناڵاندوچاوەڕێ بوو کە ئاو بدرێت ئێمەش بەسەروماڵەوە بەرز بوینەوەو چوین بۆلای ئەستێرەکان ورێ کەوتین لەگەڵیانداو بووین بە بەفروهێدی هێدی خۆمان باراندوهاتینەوە بۆلای دارگوێزو خۆمان توانەوەو بوین بە ئاو بەڵام کەم بوین هەر لەبەر ئەمەش داوای ئەکتەرمان کرد .

لەلایەکی ترەوە دەوری دوەم چەندمرۆڤێکی دزبوین چەندەها جار لەسەر دزی دەگیراین بەڵام زوو بە ردەبوین ئازاریان نە ئەدایین ئێمەش زۆر دڵمان خۆش بوو لەلایەکی ترەوە دەوری سێیەم چەند مرۆڤێکی هێمن بوین بەبێ قسە وانەمان ئەخوێند مامۆستاکەش هەربەچاو وانەی ئەداینێ هەندێ جارپێ ی ئەووتین کە گوایە لە هەندێ باردا ژمارەی دەبەچوار دەخوێنرێتەوە وکۆکردنەوەو دابەش کردن تێکەڵاو دەبێت جائەی رۆڵە ژیرەکانم ئاگاتان لەم دابەش کردنەبێت نەوەك لەتاقی کردنەوە بۆتان بێتەوە بەڵام پێش تاقی کردنەوە چاوی مامۆستافڕی ونەهاتەوە بۆلامان ئێمەش نەچوینەوە بەڵام هاوڕێ ئەوە سەیر بووکە هەندێ لە قوتابی یەکان بەبێ ئاگاداری مامۆستا دیارنەئەمان و وون دەبون هەندێکی تر ئەهاتنە خوارەوەو ئەچونە ناو هۆڵی دانیشتنەکەوەو ئەبون بە بینەرو سەیری ئێمە یان دەکرد بەڵام لەپڕ هەموو بینەرەکان شانوگەری یەکەیان لەنیوەیا بەجێ هێشت باشە ئەوان ئەو هەموو ئازارەیان لەبیر چووەوە کە چەندەها ساڵ بە هیلاکی پرۆڤەوە خەریك بوین هیچ نرخێکیان بۆدانە ناودەستیان کرد بەقسە هەڵبەستن بۆمان ئیتر هاوڕێ‌گیان بینەرەکان دوو دووسێ سێ ڕوشتن بەڵام ئەوەی سەیربوو بە زۆر ئەکرانە ناو کەشتی یەکی شکاوەوە . . . ئیتر

- ئیتر چی زریان گیان تەواوی‌بکە

- ئیتر بەدەنگی زەنگەکە خەبەرم بووەوە نەگە یشتمە ئەنجام ، ئای کە نەگەیشتنە ئەنجام ئازاری دام .

- دوێنێ شەویش هەر لەخەوما ساڵی تازە بوو هەورێکی ڕەش بەری ئاسمانی گرتبو کە هەموو باڵندەکان خۆیان کوتابوە لانەکەیان و دڵخۆشی بێچوەکانیان ئەدایەوە تاکو سڵ نەکەن لە شەڕی نێوان هەورو مرۆڤدا ، ئێمەش هەموومناڵ بوین و

دەستمـان زۆر درێـژ بووبوو ياريمان دەكردو پاڵمان بەيەكترەوە ئەنـا بۆلای كونی مارو دووپشـك ئای چيـاگيان هەر كامێكمان پاڵمـان بەوی ترەوە بنـايـە تۆزەتـۆزە قەڵەو دەبوين و گيرفانمان پردەبوو هەتا دوايی چەند كەسێكمان لەقەڵەويدا تەقينەوەو هەر پارچـەيـەك بەرمـان كەوت و دوای ئەوە دەستمـان وەكو ئێستای خۆمـانی لێ هاتـەوەو توانـای پاڵ بەيـەكتـری يـەوەمـان نەمـاو گيـرفـانمـان تۆزە خالی بووەوە چەنـد نەخشـەو نامـەی چوە گيـرفانمانەوە، دەستم برد بزانم چيان تيا نوسراوە بەلام ديسان خەبـەرم بووەوە نەگـەيشتمە ئەنجام، خۆزگە بمزانيايە چيان تيا نوسـراوە بەلام هاورێ گيـان لەگـەڵ خۆزگە بمزانيايە چيان تيا نوسـراوە بەلام هاورێ گيـان لەگەڵ ئەم هەموو هەواڵە ئاڵۆزانە دائەم شەو دەزانم لەخەومداچی دەبينم

- چۆن دەزانی

- چونكـە ئەگـەر ئەم شەويش نەبێت ئەگەر منيش نەبم ئەواتۆو رۆڵەكان ئەم شارە هەر دەبێ لەخەوياندابيبينن

- باشە بزانم چی دەبينی

- ئەم شەو لەخـەومـا لقی دارگـوێزێك قەڵەمێك لێ دەكەمەوەو دەيچێنم، دوای ماوەيـەك چەنـد قەڵـەمێكی رەنگـاورەنگم بۆ بەرهـەم دێنێ لەنـاو هەمـوويانـدا قەڵەمێك لێ دەكەمەوەو دای دەتاشم، بەپێنج خەت بازنەيەك مرۆڤێك دروست دەكەم فێری خوێنـدن و نووسينی دەكـەم، ئەويش چەنـد مرۆڤێكی تـر دروسـت دەكـات و بەمـنی دەنـاسێنێ كاتێـك لە ژ ورێكی لۆكـاويـدا بيـردەكـەينـەوە بروسكـەيـەك خۆی دەكێشێ بە ژ ورەكـەداو دەيسـوتێنێ، ئێمـەش هەر فريـای ئەوە ئەكـەوين كەبێينـە سەر ئەو تـاكـە رێگايەی كەبـەسەر كێڵگە تينوەكانـدا دەراوانـێ، سەيـر دەكەم هەريـەكـە لـەوانـەی لە گەڵمايە كـە يـەكێـكيش لـەوانـە تۆبـوی ئـەی هـاورێ گيـان دەسـت دەكـەن بە دەربـڕينی بێـزاری يـەكی زۆر هەنـدێ پرسيـارم لێ دەكەن، منيش دەڵێم هاورێينە بالەرێگای دارستانەوە بڕۆين باشتـرە تۆش دەڵێی لەبـەرچی منيش دەڵێم، چـونكە دايكم رۆژێ پێی ووتم ئەگـەر لەرێگـای دارستـانەوە بڕۆن لەوانەيە تيـابچن بەلام ئەگـەنـە ئەوشـوێنەی كەخۆتان دەتانەوێ منيش ووتم باشـە سودی ئەو خۆبـەخت كردنـە چی يـە بەبێ هيـچ ئامـانجێـك كەچی دايكم ووتی كوڕم رۆژگـار قسـەی منت بۆ ئەسـەلمێنێ لەم قسـە كردنانەدا دەبم بۆتان كەچی ئێوەش يەكە يەكـە لێم ئەتـەكنەوە هاورێ گيان دەزانی تۆش بەجێم دەهێڵی خۆشتان نازانن بەرەو كوێ مل دەنێن

- زريان من چۆن بەجێت ئەهێڵم.

- ئاخر هاورێ گيان ئەوە خەوەو هەموو شتێكی تيا ڕوودەدات

- راستە، بەلام تۆ بڵێی خەونەكان سەوز نەبن؟

- كاتێ من بەجێ ئەهێڵين، من هەردەڕۆم و كۆڵ نادەم

هەردەڕۆم لەسـەرەتاوە جلەكانم شردەبن و، هەردوو دەستم دەكـەونـە خوارەوە، بەلام هەست دەكـەم دوودەستی تازەم بۆ دروست دەبنـەوە لەگـۆشتی گيـانمـەوە، تالـە چاڵێكی بچـوك دەپـەڕمـەوە قاچم بەردەبێتـەوە، بەلام ديسـان بۆم دروست دەبێتـە، بەلام سودی چی يـە دروست بونـەوەيـان لەقـازانجی گيـانم نيـە، هەردەڕۆم تادەگەمە نزيك دارێك كەلەبەر نەبونی گەڵا خۆر بەئاسانی ياری ئەكات لەبەينی پەلەكانيا

سەرنـج دەدەم گيـانم نەمـاوەو هەمـووی بونـەتـەوەبـەو ئەندامانەی كەنامێنن، منيش دادەنيشم بير دەكەمەوە چونكە لە هەمـوو شوێنێكـدا هەر بيـر كردنـەوە پێـويستە چونكە هەربەوە دەتـوانين بگـەينـە هەمـوو ئامـانجێـك لە دوای ئەوەی كەوەك گەڵايـەكی پاييـز لەنـاوەوەی خۆمدا دەكەومە خوارەوە جارێكی ترهـەواڵی چونـەسەر درەختم پێ دەگەيەنن لەپڕ دەكەومەوەڕێ هەردەڕۆم پێ دەنێم بەخـوێنـا بەدركـا بە خۆما تاكۆتاييم دێت و بونم دەچێتە سەر درەخت و ئەبم بە گەڵا سێبەر دروست دەكەم بۆ هەموو ئەو رێبوارانەی كەلە دوای خۆمەوە لە ناو ئەچن و لەناوئەچن

- دەبـاشـە زريـان گيـان ئێستـا بنولەوە ئەچێ زۆر هيلاك بيت ئەگەر هەرچی يەك رویدا بەيانی بۆمی بگێڕەوە شەوباش

- شەو باش وا دەنوم.

● چیرۆکی: خەسرەو شاهانی

● وەرگێڕانی: محمد حسن رۆژ بەیانی

دەمویست بۆ پرسەی سێ رۆژەی جەمال ئاغا بووم ، کەسێ شەولەمەوبەر بەکارەساتی ئۆتۆمبیل ئەمری خوای کردبو، لەرێگا بە رێکەوت تووشی (سادق)ی هاوڕێی من و خوالێ خۆشبوو جەمال ئاغا هاتم .

ووتی :- بۆ کوێ دەڕۆی؟

ووتم :- بۆ پرسەی سێ رۆژەی جەمال ئاغا دەرۆم . . تۆ ش وەرە باپێکەوە برۆین .

ووتی :- من نایەم .

ووتم :- ئیش و کارت هەیە؟

بەساردیەکەوە ووتی :- سویندم خواردووەو دەستی خۆمم داغ کردووە، تا بۆ پرسەی هیچ دۆست و ئاشنایەك نەڕۆم

ووتم :- لەبەر چی ؟

ووتی :- دە دوانزدە ساڵ لەمەوبەر کاتێ کە هەواڵی مردنی «ئارمناك»ی دۆستی ئەرمەنیم بیست زۆر دڵتەنگ و نیگەران بووم چونکە بەراستی پیاوێکی ئارام و میهرەبان و بێ ئازار بوو ئەم هەواڵەش «ژ رژ»ی برازای پێ‌ی راگەیاندم واتە سێ رۆژ پاش مردنی «ئارمناك» ، «ژ رژ»م بینی و هەواڵەکەی پێ راگەیاندم . منیش هۆی مردنەکەیم پرسی :-

ووتی : چوار پێنج شەولەمەوبەر ، لەیەکێ لەچێشتخانەکان پاش عەرەق خواردنەوە، خواردنی پیسی خواردبووو «تسمم»ی کردبوو.

ووتم :- ئەی بۆچی لەکاتی کفن و دفن و پرسەکەیدا ئاگادارت نەکردمەوە؟ بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە سەرێکی باداو

ووتی :- ئەگەر راستت بوێ ئێمەش ئاگامان لەکفن و دفنی نەبووە، چونکە خوا لێ‌شبوو پاش «تسمم»و مردن، بۆ ساردخانەی پزیشکی یاسایی دەبەن: ئێمەش نەمان دەزانی و کەسیش پرسیاری نەکردبوو، پاش ئەوەی چەند رۆژێك تەرمەکەی خوا لێ‌خۆشیوو لەو ساردخانەیە دەمێنێتەوەو کەس و کاری بۆ پەیدا نابێت، کفن و دفنی دەکەن و دەینێژن ، گرفت لەوە دایە کە لەگۆرستانی ئێوەیان ناشتووە، بێ گومان ئێمەش ناتوانین بەگوێرەی بۆ مردوو دەکرێت لەوێ ئەنجام بدەین .

ووتم :- چۆن ئەی بەلەشا نەیان زانی ئەم مردووە موسڵمانە یا ئەرمەنی‌یە؟ .

ووتی :- تەنها جیاوازی کە لەنێوان ئێمەو ئێوەی موسڵماندا هەبێت، خەتەنەکردنە ، ئێوە منداڵەکانتان خەتەنە دەکەن و ئێمە نایکەین بەڵام ئێستا پزیشکانی جیهان دان بە پێویستیەتی و چاکەی خەتەنە کردندا دەنێن ، بۆیە ئێمەش منداڵەکانمان خەتەنە دەکەین ، «ئارمناك»ی خوا لێ‌خۆشبووش خەتەنە کرابوو، ئیتر پزیشکی یاسایی و پزیشکانی تر چۆن بزانن ئەو وردووە موسڵمانە یا ئەرمەنیە . بۆنەگبەتی پێناسەشی پێ نەبووە تابەهۆیەوە بزانن ، تەنها وێنەیەکی بچووکی لەگیرفاندا دەبیت کاتێ کە ئێمە چووین و پرسیارمان لە کارگێری پزیشکایەتی یاسایی کرد کومەڵێك وێنەیان پیشان داین، لە ناویاندا «ئارمناك»م ناسیەوە .

ووتم :- ئەی گیرو گرفت لەچی دایە؟

بە خەمناکیەکی زۆرەوە ووتی :

دەمانەوێ ئارمناك بۆگۆڕستانی خۆمان بگوێزینەوە، کەچی دەڵێن نابێ چونکە لەئاینی ئێوەدا گۆڕ هەڵدانەوە حەرامە مەگەر

رەزامەندی پزیشکی یاسایی و دادگای لەسەر بێت و گومان لەمردنەکەدا هەبێت.

ووتم :- بەراستی گیروگرفتێکی ئاڵۆزە دەبێ چۆن چارەسەر بکرێت؟

ووتی :- ئەگەر لەم بارەیەوە یارمەتیمان بدەی، هەرگیز لە چاکەت دەرناچین، ژن و منداڵەکانیشی پێی خۆشحاڵ دەبن خوا لێ خۆشبووش لەنامۆیی رزگار دەبێت و بۆناو کەس و کارەکەی خۆی دەگەرێتەوە.

من دەزانم ئێستا رۆحی ئارمناك لەچی عەزابێك دایە خۆتۆ ساڵەهایە دۆستی ئەوی و دەزانی چەندە هەست ناسکە لەم باسەی ژرژ بەژن و باڵای ئارمناکم هاتە پێش چاو ئەو بیرەوەریە خۆشانەی شەوانی بەهار و رۆژانی پایز و ئەو دۆستایەتیە بەتینەی نێوان من و ئارمناك وەك شریتی سینەما بەپێش چاومدا گوزەریان کرد و فرمێسك لەهەردوو چاومەوە قەتارەی بەست. راستە ئەو ئەرمەنی و من موسڵمان، بەڵام دۆستایەتی ئێمە هیچ پەیوەندیەکی بەئاین و بیروباوەڕەوە نەبوو. چونکە ئەو خوا لێ خۆشبووەش وەکو من زۆری حەز لەشیعرەکانی عورفی شیرازی و حافیز و خەیام دەکرد و گەلێ جار ئەم بەیتەی عورفی دووبارە دەکردەوە :-

[عورفی بەشێوەیەك لەگەڵ چاك و خراپدا رەفتارکە
پاش مردنت لایەنی موسڵمانیت بەزەمزەم بشۆنەوە
هینیدیەکەت بسووتێنن]

هەر کاتێکیش باسی ژیان و فەلسەفەی ژیان و ئاین و بیروباوەر بکەوتایەتەئاراوە، ئارمناك ئەم دێرەی حافیزی دەهێنایەوە :

[چەنگی نێوان حەفتاو دوو میللەت پەلپ و بیانووی خۆی
هەیە چونکە رێگای رێگای راستیان نەزانی بوونە ئەفسانە]

یا ئەم دێرەی سەعدی دەهێنایەوە :

[بنیادەم هەموو یەك رەگەزن چونکە لەیەك گەوهەو
دروست کراون]

پێویستە ئادەمیزاد لەدونیادا هەبێت، پێویستە هەر هەموو دۆستی یەك بن ، چونکە گاورو دیان و موسڵمان و ئەرمەنی هەموو یەك گەوهەرن، ئەوەی ئێمەی لەیەك جودا کردۆتەوە تەنها جۆری رژێم و داب و نەریتی کۆمەڵایەتیە . . .

ئەم جۆرە هەست و بیرەی ئارمناك و پاك رەوشتی بووە هۆی ئەوەی نەك تەنها دۆستایەتیمان ساڵەها بەردەوام بێت، بەڵکو رۆژ لەدوای رۆژیش پەرە بسێنێت و بەتین تربێت.

لەئەنجامی تەووژمی ئەم جۆرە بیرە ئاڵۆزانەو زیندوو بوونەوەی ئەو لەگرفان دەرهێناو بەیادی ئەو دۆستە خۆشەویستەم فرمێسکی چاوەکانم سڕیەوە، کاتێ کەبیرم لەغەریبی و بێ کەسی خوالێ خۆشبوو دەکردەوە، کە لەگۆرستانی ئێمەدا نێژراوە، کوڵی گریانم جۆشی دەسەند، هەستم کرد قورسایی رۆحی ئارمناکی خوالێ خۆشبووم لەسەر سینگدایە و داوای یارمەتیم لێ دەکات. دەنگای لەگوێمدا دەزرنگایەوەو دەیووت :

«راستە من خۆم لەخەڵك جودا ناکەمەوە، بەڵام لێرەدا کەس و کارو ژن و منداڵەکانم ناتوانن سەرم لێ بدەن، لەوێ ئاسوودە تر دەبم . . .»

هەر چۆنی بوو خۆمم راگرت و تف و نەفرەتم لەدونیای بێ وەفا کرد و کەمێ ئارام بوومەوە بەژرژم ووت :-

خوای لێ خۆش بێت، مردن براگەورەیەو رێگای هەموومانە. چ زوو، چ درەنگ، بەشی ئارمناکی خوالێ خۆشبووش لەدونیادا هەر ئەمەندە بوو من چیم لەدەست دێ بۆتان بکەم؟

لەوەڵامدا ووتی :- ئەوەی راست بێ شتێکی ئەوتۆنی یە، تۆ تەنها

ئەوەندەت لەسەرە ئیمرۆ یاسبەی یاهەر کاتێ کە دەستت بگات لەگەڵ مندا بێیت و سەرێك لەفەرمانگەی پزیشکی یاسایی بدەین و لای دکتۆر بڵێی شەوی رووداوەکە لەگەڵ ئارمناکی خوالێ خۆشبوودا بوویتە، ئێمەش لەلای دادیار شکایەت لە دەست تۆ دەکەین و دەڵێین گومانمان لەمردنەکەی ئارمناك هەیەو گومانەکەشمان لەتۆیەو دەمانەوێ لەگۆر دەربهێنرێ تا هۆی مردنی کوت و پری ئارمناك بزانرێ ، ئەمەش شتێکی رۆتینیەو بۆئەوەیە لەگۆری دەربهێنین و

بۆگۆرستانی ئەرمەنیانی بگێزینەوە ئەوکاتەش دەر ئەکەوێ کەتۆ دەستت لەمردنیدا نی یەو کوژ رانیش رووی نەداوە، ئێمەش سوپاست دەکەین و بابەتەکە دادەخرێو کەسیش کاری بەتۆوە نابێت. . بەرواڵەت ساکار دەهاتە پێش چاو، بەڵام لەراستیشدا ئەوەندە سانا نی یە کەژ رژ دەیڵێ.

بەدوو دڵیەکەوە وتم باشە سبەی پێکەوە بەم کارە هەڵدەستین مەبەستیشم ئەوەبوو، لەو ماوەیەدا ژ رژ لەباتی نت یەکێکی تر بدۆزێتەوە، یاهەر خۆم چارەیەکی بکەم.

ئەو شەوە تابەیانی خەونم بە ئارمناکەوە بینی و داوای یارمەتی لێ دەکردم جارەها لەخەو راپەڕیم و دووبارە پێڵوەکانم لێك دەنایەوە، کەچی ئەمجارە ئارمناك م لەودیو دەرگاکەوە بەرچاو دەکەوت. .

بۆ سیەی زووژ رژ دەرگای لێ کوتام منیش خۆم گۆڕیو پێکەوە بەرەو فەرمانگەی پزیشکی یاسایی رۆیشتین لەویەشەوە بۆ دادگا، ژ رژ شکایەتەکەی پێشکەش کرد، منیش لەپارچە کاغەزێکدا نووسیم شەوی رووداوەکە لەگەڵ ئارمناکدا بووم بەم دان پێدانانە کەوتنە پرسیار لێ کردنم :-

- لەکوێ بوون؟

- ووتم :- لەفلان چێشتخانە

- چیتان خوارد

- فلان خواردن و خواردنەوە

- تاکەی پێکەوە بوون؟

- تاسەعات یازدە.

- لەکوێ لەیەك دابڕان؟

- لەفیسان شەقام.

- تۆ بۆکوێ رۆیشتی؟

- بۆماڵ

- ئامناك بۆکوێ چوو؟

- نازانم. . . وگەلێ لەم پرسیارانە.

کەوتنە هاتن وچوون وقسە کردن ودانیشتن وپچە بچ کردنەوە ئەنجام بڕیاری گۆڕ هەڵدانەوەیان دا ، پاش دەرکردنی لاشەی ئارمناك دکتۆر کەوتە نۆرینی و تێبینیەکانی خۆی لەسەر پارچە کاغەزێك تۆمار کرد، بەبیرواری دکتۆر من ئەو شەوە ئارمناکم کوشتووە؟

1 - جێگای مست یاشتێکی لەم بابەتە بەپشت ملی کوژ راوەوە دیارە!

2 - جێگای لێدان بەپاژنەی کوژ راوەوە هەیەو پێستەکەشی رووکاوە.

3 - پەراسووەکانی بە ئامێرێکی ئاسنین تێك شکێزاوە.

4 - ناو زگی براوەو دەرمان خواردیش کراوە . . . وگەلی شتی تر، کە هەریەك لەوانە بەڵگە نامەی کوشتنە ، کاتێ کە بیرورای دکتۆرم بینی شێت و هار بووم، بەڵام ژ رژ دڵی دامەوەو ووتی ئەمە کارێکی رۆتینیەو لەبەر دەرهێنانی لاشەکەی ئارمناکی خوالێخۆشبوو ئەنجام دەدرێ، پاشان فەرمانی درا ئارمناك لەگۆرستانی خۆیان بنێژ رێ منیش دوای ژ رژ کەوتم تا ئەمجارە لەکفن ودفنی ئارمناکدا بەشداری بکەم ،کەچی بەریان لێگرتم و ووتیان :-

- تۆ لێرە بەو هەقت بەسەر ئەوانەوە نەبێت.

- بۆچی بیرورای دکتورمان پیشان نەدای!؟

ووتم :- واتا دەتانەوێ خوا نەخواستە بڵێن من ئارمناکم . . . ؟

ووتیان :- ئێمە ناڵێین ، خۆت دەڵێی: خۆت بە نووسین دانت پێدانا.

ووتم :- بەخورا بەدرۆئەوەم نووسی ،تا ئێوە بڕیاری گۆڕ هەڵدانەوە دەرکەن و ئارمناك لەگۆرستانی موسڵمانانەوە بۆ گۆرستانی خۆیان بگوێزرێتەوە.

ووتیان :- هەموو تاوانبارێك لەکاتی لێکۆڵینەوەدا چییان ووتبێت لەبەردەم دادگا بەدرۆی دەخەنەوە. ئەمە شتێکی تازە نی یە.

ووتم :- مەبەستتان چی یە؟ ئێوە حەفتەیەك لەمەوبەر تەماشای لەشی ئەو کابرایەتان کردبووو بڕیاری ناشتنتان دابوو، شوێنی لێدان وبرینداربوونتان نەدیبوو، پاش حەفتەیەك دێن و ئەم شتانە دەدۆزنەوە؟.

ووتیان :- تائێستا کەس شکایەتی نەکردبوو، کوشتنش

لەئارادا نەبوو. ئێمەش بەمردنی ئاساییمان لەقەڵەم داو بڕیاری ئاشتنیمان دا.

ووتم: ـ ژرژ دەڵێ لێی خۆش دەبم.

ووتیان: ـ لێ خۆشبوونی ئەو بۆ کاتی خۆی دەپارێزرێ و سزاکەی تۆ سووکتر دەکاتەوە ئەی کێ وەڵامی داد پرسی گشتیی دەداتەوە؟

ووتم: ـ ئەم داد پرسی کشتی یە تا سەعاتێك لەمەوبەر لەکوێ بوو؟.

ووتیان: ـ لەجێگای خۆی دا بوو.

تەماشا دەکەم وا خەریکن تەرمەکەی ئارمناکی خوا لێ خۆشبوو دەبەن و هەموو دوای کەوتوون.. هاوارم کرد: ـ

ـ مەهێڵن ئارمناك ببەن. جارێ باش لەبابەتەکە بکۆڵنەوە، بەڵکو ئاشکرا دەبێت، بە پیرو پێغەمبەر من ئەوشەوە لەگەڵ ئارمناکدا نەبووم، من لەژیانمدا مریشکێکم سەر نەبریوە، ئەمەی کەئێوە دەیڵێن ئیشی پیاو کوژانە.

ووتیان: ـ بە خۆرایی خۆت ماندوو مەکە.

ووتم: ـ باشە، بەس توخوا جارێ لەژن و منداڵەکانی بپرسن بەڵکو ئەوان شتێ بزانن و بتوانن یارمەتیم بدەن.

ووتیان: ـ کاتی خۆی بەم کارە هەڵدەستین، بەڵام هەردەبێ تۆ لێرە بمێنیتەوە.

ـ کاکە چۆن لێرە بمێنمەوە، ئاخر من ئیش و کارم هەیە لای خۆم چاکەم کرد لێم گەرین بابرۆم.

ووتیان: ـ مەگەر مزگەتە!

سەرتان نەئێشێنم شەش مانگ لەوێ مامەوەو هەموو رۆژێ لێ پرسینەوە بەڵێن و پەیمان و هەرەشە لێدان تابڵێم چۆن چۆنی بەو کارە هەڵساوم و چ جۆرە دوژمنایەتیەکم لەگەڵ ئارمناکدا هەیە منیش سەد سوێندم دەخوارد کەمن دۆستی ئارمناك بووم نەك دوژمن، ئێمە دوو رۆح بووین لە دوو لاشەدا هەمووی تاوانی عورفی شیرازیە کەکار بەم رادەیە گەیشت.

ئەمەم ووت و بەڵام ووت، وەك بنێشت نوسان پێمەوە عورفی شیرازی کێ یەوە لەکوێ یە؟!

لەلایەکەوە پێکەنینم دەهات، لەلایەکیشەوە ئەوان بەراستیان دەزانی و دەست بەردارم نەدەبوون، لەهەمووی خراپتر ئەوە بوو، چۆن عورفی شیرازی پەیدا بکەم عورفی مردووە.

ـ چۆن مردووە؟

ـ من چوزانم چۆن مردووە؟

ـ بەڵێ.

ـ تۆ چوزانی؟

ـ لە کتێبدا خوێندوومەتەوە.

ـ لەکام کتێب؟

ـ لەبیرەوەری شاعیرەکاندا.

ـ کەی مردووە؟

ـ نزیکەی چوار سەد ساڵ لەمەوبەر.

ـ هاواری کابرا وەکو تۆپ لەژوورەکەدا دەنگی دایەوە.

ـ هەی وا وا لێ کراو، گاڵتە بەدادگا دەکەی؟

تۆ جارێك دەڵێ عورفی بووە هۆی ئەوەی ئارمناك بکوژی کەچی ئێستا دەڵێی چوار سەد ساڵە مردووە قەشمەری بە یاسا دەکەی، عورفیمان پیشان بدەی و ناونیشانیماڵەکەیمان بدەیتێ لەسزاکەت کەم دەکەینەوە. دەنا سزاکەی ئەویش دەخەینە سەر ئەوەی تۆوە.

ـ هەی داد هەی بێداد، دەستم دامێنتان، ئاخر من عورفی لەکوێ بدۆزمەوە؟. ئێستا سوقانەکانیشی بۆتە خۆڵەمێش عورفی شاعیرێك بوو لەسەدەی دەیەم و یازدەیەمی کۆچی ژیاوەو لەسەر شێوازی هیندی شیعری داناوە، ئێوە مردووتان لەمن دەوێ، کە مێژووی ژیانی لەلای مامۆستایانی کولێژی ئەدەبیات دەست دەکەوێت.

ووتیان: ـ مەگەر تۆ نەت ووت عورفی بووە هۆی ئەوەی بەم رادەیە بگات.

راستە من ووتم بەڵام مەبەستم ئەوەبوو کەشیعرەکانی عورفی شیرازی بوونە هۆی ئەوەی من و ئارمناك لەیەك نزیك بینەوە، خۆ ئەگەر وابێ دەبێ برۆم خەیام و حافیزو سەعدیش بەرەو دادگا راپێچ بگەم.

ووتیان: ـ زۆر چاکە، مادام ناونیشانی عورفی نازانی بۆ

سیٚ کەسەمان بۆبێنە.

وتم :ـ کام سیٚ کەس؟.

ـ ئەوانەی کەئێستا ناوت بردن، سەعدی و حافیزو خەیام.

ـ هەی ئافەرین کاکەی سەرۆك... کەر لەکویٚ کەوتەو کوندە ەکویٚدڕاوە. کاکە لێم گەرین، بابەدوای کاری خۆمەوە برۆم و دەزانن من دەتوانم رۆح ئامادە بکەم؟. من نەمزانیٚ ناوی عورفیم هێنا، چیتان لەدەست دیٚ بیکەن، نە من دەتوانم بۆ ڕیٚو شوێنی ئەوان برۆم نە ئەوانیش بەقسەی من دەکەن سەعدیو حافیز لەشیرازن خەیامیش لەنیسا بوورە.

ـ کەی تارنیان بەخیٚ هێشت؟

ـ کیٚ کەی تارانی بەجیٚ هێشت؟.

ـ ئەوانەی کە ناوت بردن حافیزو سەعدیو خەیام.

ـ حیرس گرتمیو ووتم :ـ

ـ پاش ئەو شەوەی کەچوار پێنج قوڵی لەگەڵ ئارمناکدا عارەقمان خواردەوە.

ـ لەوە دڵنیای کە تائێستا لەو دوو شارەن و بۆشوێنێکی تر نەرۆیشتوون؟.

وتم :ـ تائێستا لەویەن بەڵام ئەگەر هەست بکەن کە بە تاوانبار دانراون، ئەوا ئاوارە وسەرگەردان ئەبن وئەم وولاتە بەجیٚ دەهێڵن.

نزیکەی شەش مانگ ئەم کێشەو بەرەیەیان پیٚ کردم، کەپێویست بەباسی کردنی ناکات.

پاش لێکۆڵینەوە و پرسین لەکەس و کاری ئارمناك و ژن و منداڵەکانی و باوکیو دایکی و خزم و خوێشی دەرکەوت کە شوێنەواری پشت مل ئارمناك ـ ی خوالیٚ خۆشبوو، بۆسەردەمی منداڵیٚ دەگەڕێتەوەو کەلەپەیژە بەربۆتەڤوارەوە. رووکاندنی پێستی پاژنەشی بۆ شەوێك پێش مردنی دەگەڕێتەوە، شەو کە بەسەر خۆشی دەگەڕێتەوە پاژنەی بەر قەرەوێلە دەکەویٚو دەی رووکێنیٚ ناوزگ بڕانەکەشی بۆزیادە خۆری لەخواردنی پیس و عارەق خواردنەوە دەگەڕێتەوە ولاتسمەی پیٚ کردووە. تێك شکاندنی پراسووەکانیشی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو شەوەی ئارمناك هەست بەناڕەحتی دەکات خۆی دەگەیەنێتە نە خۆشخانە و لەویٚ لەگەڵ دەرگاوانەکەدا دەبێتە مشت و مڕیان، کابرا چەند بۆکسێك لەسینەی دەدا.

سەرتان نەئێشێنم پاش شەش مانگ دەرکەوت بەئەمری مردووە و کوژران لە ئارادا نییە، بەرەڵلایان کردم ئێستاش کەدە دوازدە ساڵی بەسەرد تێپەریوە منداڵەکانی ئارمناکی خوالیٚ خۆشبوو گەورە بوونەومن بەتاوانیار دەزانن و دەڵێن ئەگەر ئەوشەوە تۆزوو لە باوکمان جودا نەبوویتایە تەوە بەوزوویە نەدەمرد و بڕیاریان داوە ئەگەر بچمە ماسیی وبچمە بن دەریایەوە، یا بچمە سیمرغ ولەکێوی قاف لانە بکەم خوێنی باوکیان لەمن وەردگرن. ئێستا تیٚگەیشتی لەبەرچی بۆ پرسەیهیچ دۆست وئاشنایەك ناڕۆم؟.

وتم :ـ بەڵیٚ تیٚگەیشتم ـ

•

# قرقاش

نووسینی
«سمیح القاسم»
وەرگێرانی
د. نافع ئاکرەیی

کات: هەر دەمێك.
جێگا: هەر جێگایەك

ئەکتەران: -

قرقاش، چەند جوتیار، چەند دەولەمەندو ماقول، چەند سەرباز، جوتیپارێکی شۆڕشگێر، دزەك، منالەك ژنێك، کچێك، گەنجێك، «کوری قرقاش»، دەرگەوان، وەزیرەکی ریشدار، سەربازێکی قوڵ براو، پیاوێك، ژنێك، کۆمەلێك لە یونانیەکانی کۆن و کۆمەلێك لە میسرەیەکانی کۆن، کۆمەلێك لە ئەوروپاییەکانی هاوچەرخ، کورس.

تێبینی: تەماشەکەران ئەتوانن هاوبەشی لە گفت وگۆو ئاخوتن لەگەڵ ئەکتەراندا بکەن و رای خۆیان دەربڕن چون حەزدەکەن.

«سەرەتا»

«پەردە لادەدرێ.. شانۆ روناك دەبێ بە کزی»

کورس: هەموو کاتێك... لە هەموو جێگایەك
لە سەر وێنەی مرۆڤێك دێت
دێت و مردنی لە گەڵیا دێت
دەنگێکە هەر بەرز ئەبێت
کە هاتیش هیچ راناوەستێت
لە هەموو کاتێکدا ژیاوە
لە هەموو جێگایەکدا ژیاوە
قرقاشی ناوە.. قرقاشی ناوە
قرقاشی ناوە.

«روناکی شانۆ بە پەلە توندو کز دەبێت لەگەڵ ئاوازی موسیقایەکی نارێك و گراندا، کۆمەڵەمرۆڤێك بە جل و بەرگی یونانی‌یەکانی کۆن دێنە ژووری شانۆ. . . کۆت و زنجیریان لە دەست و پێ دایە. . بە ناوشانۆدا تێدەپەڕن لەگەڵ ئاوازی موسیقادا. . پیاوێکی تر بە هەمان جل و بەرگ بە قامچی و سوندەو دار لێیان دەدات، تا دەردەچن لە شانۆ. . پاشان کۆمەڵێك بە جل و بەرگی میسری‌یە کۆنەکان بە هەمان وێنەی پێشوودا لە شانۆدا تێدەپەڕن. . لە پاشاندا کۆمەڵێك لە ئەوروپایی‌یەکانی هاوچەرخ دێنە ناوشانۆ. . وێنەیەکی مەزنی هیتلەریان هەڵگرتوە بە دەنگێکی بڵند هاواردەکەن «هایل هیتلەر. . هایل هیتلەر». . شانۆ چوڵ دەبێ و روناکی‌یەکەی کز دەبێتەوە.

## - دیمەنی یەکەم -

«دەربەگ دەچتە سەر عەرش بە پەیسکی برسایەتی»

وکۆمەڵێك جوتیار دینە ناوشانو لە هەموو لایەکەوە. هیندەکیان دادەنیش. . چەندیان لە حالەتی سەرنواندن و کرنوش بردنن. . . هێندەکیان وەستاون هەر یەکەك رووی بۆ لایەکە.

کۆمەڵە مرۆڤێك دێنە ژووری شانو بە جل و بەرگی پاك و رێك. . هەموویان تەماشای یەکتردەکەن بە بێ ئاخفتن. .

تیشکی روناکی بۆیەکەك لە کۆمەڵی دووم دەچێ و بە چاکی ئاشکرای دەکا.

**کۆرس:** چی بکەین. . . . ؟

**جوتیارەك:** عەمبارەکانی گەنم ڤالابوون. . . !

**جوتیارەك:** درەختەکانمان هەموو هیشك بوون. . !

**جوتیارەك:** رانە مەڕو ئاژەلەکان دەمری. . . !

**جوتیارەك:** شوف و پەرێزەکان دەسووتێن.

**کورس:** چی بکەین. . ؟ چی بکەین. . ؟!

«پیاوە ماقولەکان سەر نەوی و بێ ئاخوتن دەمینێن. .

تیشکی روناکی پیاوێکی ماقول نیشان دەدا. . ».

**جوتیارەك:** ئاسۆ بە پەلە هەوری رەش. . تاریك داهات

بیرەکانی گوندی ئێمە پاك هیشك بوون.

**جوتیارەك:** هاواری ترس و توقین

لە دەمی منداڵەکانمانەوە دەر دەچێ.

**جوتیارەك:** رووی زەوی دەکێلرێت. . هاوا قلیشاوە

بە ماندووبوونی قۆڵ و شانی ئارەقرێژ.

کۆرس: ولام بدەوە قوربان.

دریغی مەفەرمو. . گەورەمان.

«تیشکی روناکی پیاوی ماقولی یەکەم بە جێ دێلێ بۆ دووەمیان ئەوژی هیچ جوڵانەوەو. . ئاخوتن ناکات پاشان دەگوێرزێتەوە بۆ سێ‌یەمیان. . هەراو هوریایەك لە دەرەوەی شانۆ دەبیسترێ. . روناکی هەموو شانۆ روشەن دەکاو هەموو ئەوانەی لە ناوشانودان تەماشای ئەولایە دەکەن کە دەنگەکە لێ‌ی دێت. . دەنگی هەوارو تەپەی پێ‌ی پیاوێك نێزیك دەبێ. . جوتیارەك دێتە ناوشانوشەپرزەو جل دڕاوە، چەند پەڵەی خوێنی بە جلیەوە دیارن. . ئیشارەت بۆ ئەوجێگایە دەکا کە لێ‌ی هاتوتە ژوورێ. . ئەیەوێ قسەبکاو ناتوانێت».

**پیاوێکی ماقول:** چیت بە دواوەیە. . ؟

ئەم هەرایە چی‌بوو بۆ چی‌یە. . ؟

**پیاوێکی ماقولی‌تر:** «بە تیزو گەمەوە»

ئەوەیە کاری بێ مێشکان

وا دەبێ ئیشی نەزانان

**پیاوێکی ماقولی‌تر:** «جوتیارەکە دەگریت و بەتوندی قولی دەهەژێنێ و

وهەوار دەکا لە سەری».

کام خوای خراپە. . زمانی گرێداوی. . ؟

چیت بە دواوەیە. ؟ دەبلێ. . بێ مێشك چی‌بووە. . ؟

**جوتیار:** دوکانی بازرگانان تالآن کران.
هەر کەسی بەرگری کردن کوژران
هێرشی پیاوی گەورە
ئەسپی ئاگریان کوژاندەوە

«چەند پیاوی ماقول و چەند جوتیار بۆ ئەو لایەی جوتیارەکە ئیشارەتی بۆی کردبو رادەکەن و هاواردەکەن».

**پیاوێکی ماقول:** بروخێ.. بروخێ
هەلکەری ئاگری ئاژاوەو کارەسات
بروخێ.. بروخێ..
ئەو کەسی دوو بەرەکی دەخاتە ناو کۆمەڵەوە
مردن و روخان بۆ ئەوانە
مردن و روخان بۆ ئەوانە

**جوتیارەکان:** چی یە..؟ چ بووە..؟ چی بکەین...؟
چی بکەین..؟ چ بووە...؟ چی یە..؟

«لە دەرەوەی شانۆ دەنگی تەپە تەپ بە توندی دێت.. رەشەبایەکی تیژ و توندو پڕ توزوو درکەڵ دێتە ناوشانو.. قرقاش بە شەقاوی خێرا دێتە ژوور. خەلکی سەر شانو «میللەت» بە چەشنێکی شەپرزە کرو بێ‌دەنگ دەبن.. قرقاش لە ناوەندیاندا رادەوەستێت.. دەستێکی دەخاتە بەر پشتی و دەستێکی لە سەر شەمشیرەکەی دادەنێت و پێدا دێنێت و دەبات و بە چاوێکی خۆپەرستانەو بلندو روح مەزنی تەماشای ئەوانەی لە دەوروبەری راوەستاون دەکات و دەلێت»:

**قرقاش:** چیتانە وا کرو بێزار
ئەی میللەتی منی هەژار
جووت دەکەن و خاك دەکێڵن
سەرتان شورەو چاوتان لێڵن
لە ناو گەرداوێکی مەنگن.
چیتانە بۆ وا بێ‌دەنگن.
ئەی پیاوانی کازێوەو ئاسوی بێ‌سود

«لە نێوانیاندا دێت و دەچێت بە هەنگاوی توندو قورس.. لچیان لێ‌خواردەکاتەوەو گالتەیان پێ‌دەکات و پێ‌یان پێدەکەنێت».

**قرقاش:** ئەنگو بۆتن.. بۆتی بەردن..؟
ئادەمین.. یا خۆ دەستکردن؟
ترس لە چاوتان دەبارێ
ملی کەچتان هاتوتە خوارێ
ئەنگو بۆتن.. بۆتی بەردن..؟
ئادەمین یا خۆ دەستکردن..؟

«لە ناو خەلکەکەدا چاو دەگێرێ بە گالتەو لوت بلندی‌یەوە دەلێت»..

**قرقاش:** کوا وەلامتان..؟
جگە لە من.. هیچ کەس نی‌یە بێتە زمان
من هەر خۆم تاك و تەنها
گیرو گرفتان دەکەم رەها
لێم گەرێن هەی بێ‌مێشکینە
هەموو کارێك راست کەمەوە
ئاشتی و خوشی لە دەست چوتان
ئەبێ بۆتان بگەرێنمەوە
لێم گەرێن.. تا هەموو خەمان
لە نێو دلان بسترمەوە
ناو چاوانی کەوت و زەمان
بۆ دارەکەم کرنوش دەبا
بالم بە سەر هەر زەویەکا
درێژ کەم و پێ دابێنم
چێ نەگبەتی و نەهاتی یە
دەبێتە پیت و بەرەکەت.

**جوتیارێکی شورشگێر:**
نەچوە عەقلم.. نەچوە مێشکم
ئەوە قەوزە.. لە دەم ئاوان
پوش و پەلاشی دەم روبار

وەك وشەی تو بیٚ قیمەتە

«جوتیار بە سینگی دەرپەڕییەوەو بیٚ ترس و دەنگێ بلندی دەڵێت . .».

قرقاش . . قرقاش . . هەر چەندێکی تۆ یەکەم بی
لە دڕوندەی خوێن مێژ ی کێو بەهێزتر بی
باڵت بۆ سەر دەرزەکانی هیشکی زەمین
درێژ بکەی سایەی باڵت
بکەیتە هەورێکی ئاوز
پرکەی وەکو گۆانی چێلان . .

«بەتیزو گاڵتەوە»

ئەگەر وەکو ئەستورایی دەهۆڵێکی لێدراو بی
دێو بی . . درنجی کێو بی . . دەست وەشێن بی
خوای جادو ی
بە سەر پەرێزی دڕك و داڵ هەنگاو بنیٚ ی
هەمووی بیێتە چیمەن و گوڵ و گولزار
ئەریٚ قرقاش . . !!
چیٚ قازانجێك لە مێوەی ناو خەوتان هەیە
گەر نەزانین تۆوی چی‌یەو لە چی بووە
پەلك و تویکلی‌و شەکانی خوت بشکێنە
کاکڵەی تووی بیرەکانتمان بۆ دەربێنە

**قرقاش:** ئا ئەمەیە کاری پیاوی بیٚ دەست هەڵات
ڕێگای مرۆڤی ترسنوك
دانیشتنی بە قرو قەپ .
لە سەر بستێك زەوی رەقدا
بە هەزاران نوکی شەمشیر
درەختی بەر مێوە نادا

«چاوی دەگێڕێت و تەماشای ئەکتەرو بینەران دەکات .

**قرقاش:** ئەریٚ لە ئێوە ئەپرسم
ئەو کەسانەی لەم هۆڵەدا دانیشتون
چی بکەین ئەگەر هشلێ بۆ ئەم بیرە . . ؟
لە بەر قرچەو گڕەی هاوین
ئەوسا چی بکەین . . ؟

**جوتیاری شوڕشگێر:** «بەتوندی»
لیٚ دەدەین . . دەکۆڵین
جەرگی قولایی زەمین دەدرێنین
بۆ بیرەکی‌تر ئەگەریێن .

**قرقاش:** «بە تورەیی»
ئیمە چون خۆمان گۆرج کەین و بچینە
ناو قولایی زەمین . .
تازە بۆ بیرەکی‌تر بگەریێن . . ؟

**جوتیاری شوڕشگێر:**
پەلك و تێوکلی‌و شەکانی خوت بشکێنە
کاکڵەی تۆوی بیرەکانتمان بۆ دەربێنە

**قرقاش:** «بە ئەنگوستەکانی ئیشارەتی بۆ چاوکانی دەکات و دەڵێت:
گەر ئەم چاوانەم غەدرم لیٚ نەکەن
بە تیلاکانیان بەژنی پیاوان دەبینم
ئەگەر دەروونم پاك بیٚ‌و پرشنگێ بپژ ینیٚ
گیانێکی بە هێزو هەستێکی تیژتان
بۆ بانگێ دەکەم . . وەرن
وەرن خوای جەنگێ بانگێ کەین .

ئیشارەتی بۆ جوتیاری شوڕشگێر دەکات و بە تیزو قەشمەرییەوە .

**دەڵێت:** نا . . نا . . ئەی خودای جادوکەران
با هنگاومان راتەکێنین . . کەندری برسیایەتی
با بێنە خوار لە سەر ئاسوی نەخوشی‌یەتی
دەستمان پر کەین لە چاکەو بوون
بە رەورەوەی بەرەو پێش چوون
بگەینە گشت ئاواتەکان

**جوتیاری شوڕشگێر:**
«مەبەستی ڕاپەڕینی جوتیاران»
ئەی برایان . . خوشەویستان

تا دەسکەوتی قرقاش زۆر بێ
دەبێ بەشی ئێمە کەم بێ .
«حـالی جوتیـاران شەپـرزەدەبێ . . تەمـاشای یەکتردەکەم
بەڵام ناتوانن هیچ رێگایەك بدوزنەوە» .
قرقاش لێیان مۆر دەبێتەوەو دەڵێت» .
**قرقاش**: دەترسن . . ؟
لە چی دەترسن . . ؟ لە کێ دەترسن ؟
ئەگەر ئەنگو بۆ تێکدانی ئاستەنگ هەڵسن
گەر شەمشیری باپیرانتان هەلیکێشن
بۆ ئەوانەی لە ناو پێستی خویاندا رزیون
هەستن . . تا وڵاتمان بکەینە
قەڵا بۆ نەتەوەمان و
قەبر بۆ دوژمن مان و
بیکەینە دادگای زەمان مان
. . . . . . . . . . . .
لە مردنی پێش دوژمنان مەترسن
بۆ وا بێدەنگ‌و حەپەساون
کێ لە ئێوە دەترسێ بۆ ژیان
کاتی ئاڵای دەستی خۆمم شەکاندەوە
پێ دەخەینە سەر سەنگەری دوژمنان
. . . . . . . . . . . . . . .
کەسێك هەیە لە ناوتانا . . بترسێت . . ؟؟
**جوتیارەك**: کەس نییە . . کەس نییە . . . !
**ئەوانیتر**: ئاڵامان داوە بە تو
تۆ بەرزت کردوتەوەو
بەرزی هەر بۆ تۆیە
**جوتیاری شۆڕشگێر**: «بە تورەیی»
من دەترسم . . تێبگەن بۆ دەترسم . . !
پاشان پەشیمان دەبنەوە
دەڵێ : ئەنگوتان تێردەکا
بەڵام هەر برسیتانە
دەڵێ خوشیتان فێر دەکا
کەچی سەنگە قەبرتانە
دەڵێ گشت نان رزگار دەکەم
بەڵام مردن دەیارێنێ
داهاتی خستوتە دەست تان
بەڵام تەنیا هەر بە قسە
راوەستانتان ئاشتییەو
لە ژێر ئاڵای ئەودا نییە
براکانم ئەم قرقاشە
لە رەگەزی ئێوە نییە
خۆتـانی لێ بپـارێزن . . تێبگەن مەخەڵەتێن ئەگەر قسەی من وەرنەگرن
دوایی پەشیمان دەبنەوە
«جـوتیـارەکـان تەماشای یەکتردەکەن و لە نێوانیاندا ئاخوتن زۆر دەبێ‌ی پیاوەماقولەکان دەوری قرقاش دەگرن» .
**قرقاش**: ئەی میللەت . . ئەی خوشەویستانی من
ئاڵای من و قەڵاتی من
دیارە . . لە ناو رێزەکانتان
سەری ماری پڕ ژار هەیە؟؟
«لە دەرەوەی شانۆ دەنگی هەنگاوی گرانی پیاوێك دێت بە ئاوازێکی گرو گۆرانی نارێك دەڵێ :
دز:دزم دزم هەتا ماوم
هەر دەمێنێم و نامرم
من برسیم وماڵی دراوسێ پڕ لە نان .
«دێتـە ناو شانـۆ . کیسـەکەی سەر شانی بە زەوی‌دا دەداو بلندی‌و دروندەیی پێ‌دەکەنێ . . گەلێك ماندوو دیارە» .
**قرقاش**: لە کوێ هاتوی . . ؟
چی لە ناو کیسەکەت دایە . . ؟
دز: پڕە لە نان . . پڕە لە گوشت و . . پڕ لە زێر . . !
«پێ دەکەنێ‌و ناوچاوانی خۆی بە قۆڵی کراسەکەی پاکژ دەکا» .
دز: گەلێ شتی خۆش و پڕ بەهام پێیە
**قرقاش**: چاکە . . چاکە . . وڵامی پرسیارم بدە

لە کوێ هاتی . .

دز : «پێ دەکەنێ و بە ئاوازەوە دەڵێت» .

دزم . . دزم هەتا ماوم

هەر دەمینیم و نامرم

من برسیمەو . . ماڵی دراوسێ پڕ لە نان

**جوتیاری شۆڕشگێر** : نانی دراوسێ حەڵاڵە

بۆ ئەوەی لە دەرگای بدات

بەڵام حەرامە . . بۆ ئەوەی دزی بکات .

«تەماشای دەوروبەری دەکات»

ئەی خەڵکینە . . خاکەکەمان میهرەبانە

بەشی داوا کاران دەدا

بەرهەم دەدا بە کرێکاران

گەر کار بکەن

ئەی خەڵکینە . . خاکەکەمان میهرەبانە

ڕۆتکرن و تالان تاوانە

وەرن بخازین لە زەمین . . ئەو زەمینەی دایکمانە

گەر دەستمان کرنوش نەبا بۆ تەور

گوڵی گەنم سەر دانانەوێنێ بۆ داس

**قرقاش** : «ئاخوتنی دەبرێت»

ئەی برایان . . چیتان دەوێ باوا بکەین

زەمین هیشك و شۆرە کاتە . .

چی بکەین باشە . . ؟

لەو لای سنوورماندا هەیە

مێرگەکی مەزن و ڕووبارێکی بێ سوود

دراوسی یەکان . . دوژمنمانن

باری گرانیان هاویشتوتە سەر شانمان

چیتان پێ بلێم با وا بکەین

شەمشیرەکانتان دەرکێشن

بە هێزی من . . خۆ ئازاکەن

ڕێزەکانتان پاك کەنەوە . . لە ترسنوك و خائینان

ئەوانەی ئاگری ناکۆکی هەڵدەکەن . . !

«بە وێنەیەکی شێتانە تەماشای جوتیاری شۆڕشگێر دەکەن» .

**جوتیاری شۆڕشگێر** : ئەی خەڵکینە چاوتان ڤەکەن

قاتلی من خۆی دەکوژێ

**قرقاش** : دەی بۆچی چاوەڕێ دەکەن

سەرکەوتن چاوەڕێی ناوێ

با لاشەکەی بکەینە بوار

بە سەریدا سەر بکەوین . .

**جوتیارەك** : با بکوژرێت . . !

**جوتیارەك** : بەردە باران بکرێت .

«روناکی دەکوژرێتەوە لەگەڵ هێرش بردنی هەموویان بۆ سەر جوتیاری شۆڕشگێر بە چەقوو خەنجەر و ئەوژی هاوار دەکا» : ـ

قاتلی من خۆی دەکوژێ . . !

«تا بێ روح دەبێ . . شانۆ روناك دەبێتەوە بە روناکی یەکی کزو ڕەنگی ئاڵ . . » .

**قرقاش** : ئەمجا وەرن . . دەی با بڕۆین بۆ پێشەوە کەسەك هەیە درێغی بکا . . ؟

**هەموویان** : نا . . نا . . کەس نی یە

ئالای ئێمە بە تووە بڵندە

«هاوار دەکەن» .

بژی . . بژی . . بژی قرقاش

ـ پەردە

## ـ دیمەنی دووەم ـ

•

«قرقاش گەنمی خەڵك دەدورێت و ئاوی بیرەکانیان دەخواتەوە» .

شانۆ بیابانەکە . . چەند درەختێکی شکاو . . سەربازان دەگەڕێنەوە لە جەنگ . . دەسکەوت و تالانیان هەڵگرتوە . . . چەند زامدارو قوڵ براو و شەل و سەقەت لەگەڵیاندان چەند منداڵ و پیاو و ژن پێشوازی سەربازان دەکەن و لە کوڕو خزمەکانیان دەپرسن و دەگرین» .

**سەربازان:** «بە سروود دەڵێن».

ئەو سەربازە دلێرانەی تۆ ئەی برسی
گەڕانەوە لە هەڵمەتی پڕ مەترسی

**کورس:** کوا..؟ ئێمە نەگەڕینەوە..!

**سەربازان:** گەڕانەوە.. چاوەڕێ وەرزەکان مەکەن
گەڕانەوە... پڕ لە تالان و دەسکەوتان

**کورس:** ئێمە هەرگیز ناگەڕێینەوە.

سەر. بازان: بمان بەخشە ئەی نیشتیمان.
بە جێ ماون لە دوای خۆمان
گەلێك دەست و لاق و پێمان
فەرمانی توندمان پێدرابوو
«قەدەغەیە گەڕانەوەی لاشەی مردوو»

**کورس:** ئێمە نەگەڕێیەوە.. نەگەڕاینەوە

«سپێدەی رۆژێکی هاوینی.. پەرێزەکی گەنمی پێگەیشتو.. چەند دارێکی لە یەك جودا دیارن.. چەند جوتیاری پیاو و ژن و منداڵ دروونەی دەکەن بە شادییەوە پیرەمێردەك رادەوەستێ لە کار و ئەیەوێ خۆی راست بکاتەوە.. دەستەکی بە تەێشتییەوە دەگرێت».

**پیرە مێردەکە:** کەمێك پشوو بدەین ئێستا
کوزەی بێنە کچەکەم هەستە

**کچەکە:** دەی با گۆرانی بڵێین.
زورناتمان بۆ لێدە وەستا

**گەنجێك:** بە شایی خۆمان شاد دەکەین
دەستمان بگرینە ناو دەستە

«کچەکە ئیشارەتی بۆ پیرەمێردەکەی دەکا و بە تیز و قەشمەرییەوە دەڵێت...».

**کچەکە:** پیرەمێران ئەبەخشین.
شایی نەکەن لە گەڵمان

«هێندەکیان پێ دەکەنن و پیرە مێردەکە بە توندی و تورەیی هەڵدەستێ و دەڵێت».

**پیرە مێردەکە:** ـ با بزانین کێ بێ هێزە
من یا ئەو تۆتەڵانە

«چەند کەسێك پێ دەکەنێ»: ـ
وەرنە داوەت و شایی
وا قەل گۆرانی دەڵێ..!

«هەمووی پێ دەکەنن»

**کچەکە:** کوتری جوانی ئەم دەشتە
گۆرانی دەڵێ وەك بلوێر
لاوان بۆی دەگێڕنەوە
گوێ بگرە ئەی پیرەمێر

«چەند کەسێك پێ دەکەنن و گەنجێك شمشاڵ لێ دەدا لەگەڵ کچەکە گۆرانی دەڵێ و ئەوانەی‌تر شایی دەکەن».

**کچەکە:** بە خێر بێ‌ی ئەی گوڵی خوێن
خۆشەویستی پڕ برین
پڕ بە دڵ خۆشم ویستی
لە یەکەم رۆژی ئەڤین.

«ئەوانەی‌تر لێی دەگێڕنەوە.. پاشان دوو بارە بە تەنها دەڵێت».

تامی شیعرانی لێ دێن لێوەکانم
مێوەی ئاگرینە گەرمای ڤیانم
دڵوپی فرمێسکم دانەی مروارین
وەك کرانەوەی قەلسی هەنارن
لە کاتی سپێدەدا.. لە بیر دەکەین زامەکانمان
گۆرانی دەڵێین لە سەر خەمان
بە خێر بێ‌ی ئەی گوڵی خوێن
خۆشەویستی پڕ برین
پڕ بە دڵ خۆشم ویستی
لە یەکەم رۆژی ئەڤین
وا بوینە خزم و پێکەوە دەژین

«هەموویان پێکەوە گۆرانی دەڵێن، دەنگی هەرایەك لە دەرەوەی شانۆ دێت.. هەموویان کردەبن تەماشای ئەو لا و ئەو لا دەکەن.. «قرقاش» دێتە ژوورێ کەرەستەی راوی پێیە لەگەڵ چەند سەربازو هاورێیەکانی و گەنجێکی جوانیش یان لە گەڵدایە «کوری قرقاش»ە جوتیاران لە ترسان سەرپان

دادەنوێنن و کورنوش دەبەن :

**قرقاش:** «بەتوڕەیی» : چون گۆرانی ئەڵێن . . ؟ من لە ڕاوم!

بڵێن بۆ . . ؟

دڕوندەکان دەترسن

پەرندەکان دەلەرزن

لە بەر گۆرانی گوتنی ئەنگو

«بە توڕەیی تەماشای کچەکەی دەکاو دەڵێت» .

گوێم لە گۆرانی تۆ بۆ ئەی ئەزانی

بە ناوی خۆم و ناوی وڵاتمان

قەدەغەیە گۆرانی گوتن . . ها!

قەدەغەیە . . هەتا . . هەتا . . !

هەر سروودی شەمشیرو بڵندانە

دەبێتە سروودی ئەم نیشتیمانە

باش گوێیان لێ بێ . . !

«بە دەنگێکی نافوش و نەشاز سرود دەڵێ»

ئەمە فەرمانی منە ئیمرۆ لە ناوا

ئەبێ ببێتە بەندێك لە یاسا

هەموو کارێك رادەوستێنن

شارەکان بخەملێنن و برازێنن

پەنجەرەکانی وڵاتە نەمرەکەم

دڵی زیندەوەرەکان پڕ بێ لە شادی

لە کاتێ . . فەرمانی شاهانەم

دەردەچێ بۆ گەڕانی ڕاو

یا گەڕان بە دوای دەرهێنـانی پاشمـاوە کۆنـەکـان یاسایەکە پێ‌دا دەچێت و دەڵێت :

هەموو گۆرانی گوتنی نەزانەکان . . قەدەغە دەکرێن

وڵاتە شارستانی‌یەکان . .

گۆرانی بۆ شەمشیری تیژ دەڵێن

«بە قەشمەری‌یەوە»

نەك بە کێماسی داس و هێنجاری بێ بەهاو

نیگاهەکانی ساردو بێ قیمەت .

«قـرقـاش دەڕواتـە دەرەوە لەگـەڵ هاوری‌یەکانی . . لاوی گەنـج دەمێنتـەوەو خۆی نیـزیکی کچـەکە دەکات و چانەی بە ئەنگوستی بڵند دەکات و سەری بەرز دەکاتەوە» . میر «کوڕی قرقاش» :

هەستە ئەی بۆکی نێرگزان

«تەماشای ئەوانی تر دەکاو ئیشارەتیان دەداتێ»

ـ هەستن ئەی خزمانی ئەو

«ناوێرن هەستنەوە . . پێ‌یان دەڵێت بە شادی‌یەوە»

ـ منم کوڕی شاهی پایە بەرز

هەستن ، هەستن و مەترسن

«پێکەوە هێدی هێدی هەڵدەستن»

**میر:** پێم ناخوشە ئازار زۆر بێ

جوانی‌یەکان ژی بێ بایەخ بن

پێم ناخوشە . . پێم ناخوشە

لێم ببـورن هەرچی بووە . . ئەی برا هەژارەکـان رازی ببن بە هاوری‌یەتیم .

«خەڵکەکە بە شەپرزەیی‌وە تەماشای یەکتر دەکەن . . شازادە «میـر» رووی وەردەگێـریتـەوە لای کچـەکـەی کە لە حالـەتی هەراسان و شەرمینی‌یەوە دایە» .

**میر:** لەو کاتەوە . . گوێم لە گۆرانیت بۆ

ئەی کچی چاکی داوێن پاك . .

دڵم کەوتە پەلە قاژە

بزوت وەکو چولەکەیەك

لە قەفەسی زێرینمدا

پا دەستەکانم بگرن . .

ئەو جوانی‌یەی خەلك راکێش دەکا

ئەی گوڵی قەد پاڵی چیا

شیـن بووی لە دەم کانـی و چیـمـەنـی رازاوەی خوا با پەرستگای پاکی تو قەبولم کا خونچە جوانەکەم . .

با پارانەوەی ئەڤینم بەرزبێتەوە

بە بەر دەمی خوای داهاتوی زەمین

. . . . . . . . . . . . . . .

ماوەم دەوێ رۆخێنەری ناوەکان

کچەکە سەری بەرزەکاتەوەو بە چاوی پڕ فرمێسك بە لەرزو ترسەوە تەماشای میر دەکا».

**کچەکە:** قوربان.. گەورەم

ئەی خاوەنی شەمشیر.. فەرمانڕەوای من
گوڵی کێوی بۆ کۆختەکان
رازاندەوە خوای هەژاری
لە شەوی رەشی هەتا هەتایی‌دا
نەیدا بە کۆشکە بەرزەکان
بە دەستی خوای بەرزەکاری
لە رۆژانی سپی هەتا هەتایی‌دا
..............
ئەی شای گەنم و گوڵا لەکان
شەمشیرو پاسەوانی من
خوزگا بمزانیبا.. رێگای جادووکەرانی دوور
ئەوانەی لە وڵاتە دوورەکان دەژین
دەستەکانم پێ دەگۆڕین
بە دوو باڵی سپی و رەنگین
تا بەیانی زوو بەرز ئەبو
دەفری لەشی تامەزرۆی من
لە خانوە قوڕینەکەمەوە
بۆ بەرزایی کۆشکەکەی تۆ

**میر:** کۆشکەکان وا کڕنوش دەبەن
کۆختەکان ژێ بەرزدەبنەوە
تا پێك*بگەن.. تۆ و خۆرو ڤیانی من
ئەی جوزەرەی گوڵی نێرگز

«کچەکە هەر وەك لە خەون دایە»

قوربان.. گەورەم.

کە تارمایی خەون دادێ
خەیاڵ دەست دەکا بە گەڕان
کە تارمایی خەون داهات
دێم و بەری پێت ماچ دەکەم
وەك پەروانەی بیابانی ئەفسانەکان
کە تارمایی خەون دادێ
فەرمان بدە، دوات دەکەوم.. تا دەریای تاریکستان
بە هەموو دۆرگەوجەزیرەکاندا بگەڕێم
بە چیای روانگەی ئەژدەهاکاندا هەڵگەڕێم
ببمە سایەی پێیەکانت

«بە لێوە لەرزەوە لە «میر» دوور دەکەوێتەوە لەگەڵ خزم و کەسەکانی دەچتە دەرەوەی شانۆ..».

ـ قوربان.. گەورەم..

«میر تەماشای دەکات تا لە شانۆ دەردەچێت، رادەوشێت پاشان بە شەپرزەیی دیت و دەچیت کە دەستەکانی لە پشتەوە یەکیان گرتووە.. پاشان لە سەر بەرێك نێزیك درەختێك دادەنیشێ»

**میر:** «بە سروود گۆرانی‌یەوە».

دوورم من.. خۆشەویستەکەم... دوورم
خاوەنی قەسری پڕ زێری سورم
پێم خۆشە مردن لە سایەی ئەودا
پیم هیچە قەسرو هەر چی‌یەکی تێدا
دوورم ئەمن.. دوورم ئەمن
دەنگی تۆ زۆر برندەیە.. هەموو شتێکی ئەبڕێ
چاوەکانت کانی خەمن.. چاوەکانت وەك گێژەنن
چاوەکانت بەیانی شەوی رابردوون
چاوەکانت مەرگی منن
چاوەکانت هەستانەوەی تازەی منن
دوورم ئەمن.. دوورم ئەمن
من دەزانم خوێنی من فرمێسکی تۆیە
خواردن و گوڵزاری من.. سروودی برسی‌یەتی تۆیە
مەمبەخشە.. نا.. نا.. نا.. مەمبەخشە
هەتا لە بەر چاوەکانا پاك ئەبمەوە
نێزیکم مەبە. تا بە چاکی پاك نەبمەوە.

«لەو کاتەدا وەزیرەکی ریشدار دێتە ناو شانۆ، شەپرزەو ونارەحەت و بە غار.. کە «میر» دەبینێ رادەوەستی و هەناسەی هەڵدەمژێ و هەست بە خوشی دەکا.. میر وا دیار دەبێ هەر

وەك لە خەونێكی دوور و درێژ هەلستابێ .
وەزیر : «بە شێوەیەكی پر گللەیی» .
گەوررەم . . .
ئەم دیوە من . . تا تەمەنی پیری ئێستام
مانگ بە تەنیا ترێفەدار بێ
ئەستێرەكان لە چوار دەوری پرشەنگ نەدەن
یان جێگری تەختی شاهی
سوارێكی زۆر لە سایەیا تیپ تیپ نەروون
گەر جەنابت فەرمانێكت دەركردبا
سەربازەكانت رێز دەبوون
پتەو وەك دیواری ئاشتی
شەپرزە نەدەبوو میللەت لە مەترسی بزربوونت
هەر وەك دەزانی گەورەی من
جەنگەل بێ دروندەی گۆشت خۆر نابێت .
یان نەزانێكی پیاو خەراپ
لە بەر ئەوە هاتم و . . زۆر بە گۆر هاتم
دلم لە پێش لاشەم گەیشت
بۆ دوزینەوەی زاتی شاهانەت
لەم بیابان و دۆلی درێژ دەگەرام
میر : بیابان و دۆلی درێژ . . ؟
بیابانی چی . . ؟! «بە تورەییەوە»
بە سینگم دا نەبە خوارێ دودانی وشەی ژەهراویت
وەزیر : بەشەپرزەییەوە» .
گەورەم بمبەخشە . . قوربان بمبەخشە
كلۆلێكی بیچوی خاكی وەكو بەندە
چون دەگاتە رازی ژیری . . وەكو ئێوە
میر : «بە ئارامی یەكی شەپرزەوە» .
باشە . . چاكی تێبگە رازی راستی
ئیمرو هەموو شورەكانی قەلای تاریكی روخان
ئیمرو توانیم روخساری خۆم بە چاكی بە چاو ببینم
«بێ دەنگ دەبێ» .
ئیمرو خوای خۆشەویستی نەمر
دل و رێگای روناك كردم
وەزیر : «خۆی بە شادی نیشان دەدا» .
وەی لەم مژدەیە . . وەی لەم مژدەیە
دەسا با شاری روناكی
دەرگای مێژ و بە دەهولی شادی بكوتێ
ئەی قەلایەكانی وریا لە سەرانسەری جیهاندا
لێدەن زەنگی زێری شادی
«بە دەنگێكی كپم و ئارامی ئەیەوێ زیاتر بزانێت و دەلێت» .
كێ یە ئەو شازادە جوانە؟
میر : «بە گالتەوە» .
بلێ كێ یە ئەو جوانە نەناسراوە . . ؟
كێ یە ئەو شوخە هەژارە . . ؟
خوشەویستەكەم . . سەرداری دلەكەم
گۆلالەی سپی لوتكەی بەفرینم
كیژێكی ئەم میللەتە هەژارەیە
لەكاتی گۆرانی وتنا . . دیتم و باوەرم پێ كرد .
وەزیر : «بە شەپرزەیی و حەپەساویی وە»
بەلام . . بەلام گەورەم
میر: «ئاخوتنی دەبری»
پێم گوتی شورەكانی تاریكی روخان
توانیم روخسارم ببینم
وەزیر : «بەناراحەتی وە» .
بەلام خاوەن شكۆ قەدەغەی كردوە
جگە لە روخساری پیروزی ئەو
هیچ شتێكی تر ببینین . . . !
میر : «بە تەحەددی و بلندی یەوە» .
ئەو رۆژەی من دەبم بە خاوەن شكو
تو دەتوانی روخساری من نەناسیوە
وەزیر : «تەئكیدی قسەكانی دەكات»
لەو رۆژەدا روخساری تۆ
پر شكۆترین روخسارەو دەیناسمەوە

فەرمان بدەو . . بڵێم بەڵێ

میر: لە دەروونی فراواندا

ڕێگای رازان دەپشکنێ

ئاڵاکانی چالاکی‌یەو . . بە جادوویی دەکرێتەوە

تا دەربچێ لە ناوماندا . . دروشمەکانی ناکوکی

گوڵێ رازاوە بشنێ . . لە بەر دەمی پاشە روژا

وەزیر: «بەمونافیقی‌یەوە».

فەرمانی شاهانەت چی‌بێ

لە سەر سەرەو لە سەر چاوە

ئێزێکی خاوەن شکۆ دەبم، لە وڵاتی نەزانراوا

ئەو وڵاتەی کەس نایزانی جگە لە بیری روناکم

ئەو بیرانەی لە روناکی تەمەنی خوم دەسکەوتوە

چاکە دەبێ . . باشی دێنێ

بۆ گەورەیی پڕ شکۆمان و

بۆ تۆ و بۆ ئێمە هەموومان

بۆ تەختی شاهانەی وڵات

کە چوار دەوری فریشتەی پیروز گرتویە

«تەماشای ئەو جێگایە دەکات کەتیا هاتوی بە شەپرزەیی».

ئێستاش فەرمۆ بابگەینە مەوکبی خاوەن شکۆمان

«دەستی بە ئەستوویەوە دەگرێت و دەڵێت»

گەر حەز بکەی لە سەر سەرم

شایی و زەماوەند بگێڕێ

[illegible]

دوو پیـــاوی سەروچاوپێچـــایی دێنــە . . ناوشانــۆ . . . لافیتەیەکیان بە دەستەوە . . لە سەری نوسراوە».

[جــەمــاوەر کاتێــك هەست بە چەقــو دەکــا کە گوشتی لێ‌بکــاتــەوە . . ئەوســا ماوەی بیـرکـردنـەوەیـان نامینێ چی بکەن . . گەر بیانەوێ ژیان دەست پێ‌بکەنەوە].

شانـۆ هۆڵـەکی گەورەیـە لە ناوەنـدی‌دا تەختی سولطـانـەو مێــزەکی مەزن لە پشتــەوە . . تەرازوی داد بە سەر دیـــوارەوە هەڵـواســراوە لەگـەڵ روزنـامـەیەك . . قرقاش تەماشای خوی دەکـات لە ئاوێنـەیەکی مەزن دا . . دەستی بە شەمشیرەکەیەوە دنیت و دەیات . . دوو سەرباز خەریکی پاککردنەوەی نیشان و پێلاو جلەکانی دەبن لە پڕ دووریان دەخاتەوەو بە هەوارەوە دەڵێت:

قرقاش: ئیمرو روژی یاساو دادە

با کاتمان بە فیرۆ نەچێ

کوا سەربری دەست بە خوێن . ؟

کوانێ کتێبی یاسا

لە کوێن تاوان بارەکان

با بێن . . وەرن . . ئیمرو روژی یاساو دادە

«هــەر دوو سەربــاز سلاوی سەربــازی دەکــەن و بە غار دەردەچن و هاوار دەکەن».

سەربازەکان: بە دادەوەو بەتەرازو

گەورەمان . . کوری خۆر . . .

خودای ژیری . . بانگتان دەکا

وەرن . . وەرن ئەی خەلکینە

خوشەویستی لێ وەربگرن

«قــرقــاش لەســەر تەختــی سەلـتــەنــەت دادەنیشێ و صەولـەجـانێکی مەزن بە دەستی راستەوویە . . چەند پیاوێکی ماقــول دێنـــە ژورێ . . زەوی بەر پێ‌ی ماچ دەکــەن لە دەروبــەری دادەنیشن . . چەند سەرباز دێنە ژورێ . . بە رێوە چوونی تونـدی عەسکـەری، وێنـەی تەرازوی داد دەکـەوێتـە خوارەوەو هیچ کەس گوێ نادەنێ و ئاگای لێ‌نابێ» . .

قرقاش: بە ناوی ئەو دادە گەورەی

لە خوای بروسك و هەورەوە

بۆ ئێمە بە جێ‌ماوە

ئەم دانیشتنەمان دەکەینەوە

«پیـاوێکی ماقول رووی وەردەگێریتە سەربازێك کە نێزیکی دەرگا وەستاوە».

دەرگەوان . . تاوان باری یەکەم بانگ کە .

دەرگەوان: پاوێژنە ژۆر ئەوەی نرخی چاکەی شاهانە نازانێت
با لە بەر دەمی دادپەر وەری گەورەماندا ئامادەبیت
«سەربازێك دێتە ژۆر ژنێکی کوڕ کوژ راوی داوەتە پێش و فرەیّی دەداتە ناوەندی شانۆ».
پیاوی ماقول: «لە بەرگی تاوانباری».
ئەم هیچە بەختەوەر نەبووە
شەهید بدا بە گەورەمان
لەو رۆژەدا هێرشمان برد
بۆ درووونەوەی گەنم و دەغل..».
لە ناو خاکی دوژمنانمان
«ژنەکە هەڵدەستێتەوە سەر ئەجنوو هاوار دەکا بە دەم چاوی پیاوی ماقولدا..».
ژنەکە: بۆ ئەوەتان هێرش نەبرد
دڵی زەوی یەکالاّ کەن
بۆ ئەوەتان هێرش نەبرد
ئاژەڵی برسی قەڵەو کەن
بۆ ئەوەتان هێرش نەبرد
منالّ لە باوەشا بنویّ
نەتان هێشتوە تاقانەکەم
رووبەت لەسەر سینگم دانیّ
کردتانە پارچەیەك ئاسن
ئینجا بوتان هێنامەوە.
«ژنەکە بە توندی دەگرێت.. قرقاش پێکەنینەکی بلّند دەکاو بەتیزەوە دەلێت:
قرقاش: لە کویّ فێری ئەم خەمە بوی
ئەی کچی خائینی نەزان
لە چیّ ولاّتیّ ئەمە بووە
کەسێك هەر چی بیەویّ بیکا
«بە تورەیی تەماشای یەکەك لە پیاوە ماقولەکان دەکات»
لەم ساتەوە لەم روژەوە
توم کردوّتە وەزیری خەم
تا خەم بخوی لە جیّی میللەت

ئەوەك ئەژ وەهای ئاژاوە
سەری خوّی بەرزکاتەوە
«ئیشارەتی بۆ ژنەکەی دەکاو لە بەرزییەوە تەماشای دەکا
ئەو ژنە شمان حوکم داوە بە راوەستان
هەتا شەش رۆژ لە سەر یەك لاق
لە نیوە شەو و نیوە رۆژان
لە رێگای کانییەکانەوە
پێش تەواو بوونی شەش رۆژان
ئەبیّ حەوت منالّ بریّ
هەفتەمینیان ئەبیّ بچێت بۆ سەربازی
شەشەکانی‌تر..! ئەوان ژی هەر بۆ سەربازی
«دەمی دەبەستن و دەردێخنە دەرەوەو دەنگێك لە دەرەوەی شانۆ:
داوای گەورەی خومان دەکەین
تەشریف بهێنیّ بۆ خواردن
«قرقاش ئیشارەتی بۆ سەربازێك دەکا بەبیّ ئەوەی ببینیّ».
قرقاش: لە جێگای من باری دادبەخشی هەلگرە
تا دووبارە ورشەی دادم
لەم هۆڵەدا دەدرەوشێتەوە.
«هەموویان هەڵدەستن و قرقاش دەردەچیّ لەسەر ئاوازی موسیقای نارێك سەربازەك لە وەستاندا دەمێنێتەوەو تەماشای ئەو لا ئەو دەکات.. دەستی بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و لە سەر کورسی داد دادەنیشیّ: -
سەرباز: بە ناوی دادو گەورەمان
لە تاوانی تاوانباری دووەم دەپرسین
دەرگەوان: تاوانباری دووەم بابیّ..
«سەربازێك پالی بە جوتیارێکی پیرەمێردەوە دەنیّ و دێنێتە ناو شانو. جوتیارەکە کورنوش دەباو لە ترسان دەلەرزیّ».
سەرباز: ئارام بەو مەترسە مامە
پێمان بلّیّ خەتات کامە
من کتێبەکانی یاسام نەخوێندوتەوە
بەلاّم دادی نەزان ئەتوانی

زوڵمت لیٚ دوور خاتەوە . ،

**جوتیار:** «برەك ئارام دەبیٚ»

ئەی دادراگەری زەمان
کاتیٚ بۆ جەنگ چوون کورەکان
پەلە گەنمی منیان شکاند عارەبانەکان
دارو درەخت بە نالی ئەسپ شکان
درێژی نەکەم . . دادگەری زەمان
دوو دڵۆپە فرمێسکم هەڵوەراند
بۆ خەم و پەژارەکەی دوێنیٚ
یەکەمیان بۆ کورەکەم کە لەگەڵ سەربازان رویشت
دووەمیان بۆ ئەو رۆژەی رویشت و
بانگ کرد دەرگای مالـمان
ئەریٚ دەگەرێتەوە . . ؟؟
وەڵام داوە بە دەرگاکەمان
ناگەرێتەوە . . . ناگەرێتەوە

«سەری دادەنەوێنی و دەلەرزیٚ»

**سەرباز:** «بە توندی رادەپەریٚ»

ئەزانین کە بەندی یاساکانی میری
بریاری لە داردانی تۆی دەدا
بەڵام دادی نەزان فەرمان دەدا
ئەبیٚ لە مالی دەولەت وەربگری
ئەوەندەی پیٚی بەریٚ بچیٚ و
تۆڵەی کشت و کالی لە ناو چووت بکاتەوە
بەرەورەوەی جەنگ و . . بە نالی ئەسپی سەربازان
داد لە رژێمی نەزانانندا دەڵیٚ
خەم بۆ کورت حەقی تۆیە
نەك ئی وەزیرەکە خەم بخوات
فرمێسکی خۆی لە سەر کاغەر برژێنیٚ
لە بەر ئەوە من ئەزانم
مێژووی باپیران نازانم
جوغرافیای وڵاتان نازانم
حوکم ئەدەم . . تو لە سەر حەقی

«جوتیارەکە ئەیەویٚ دەست و پیٚی سەربازەکە ماچ کە، ئەو بە تورەیی .

**ئەڵیٚت:** گەر کشت و کاڵت نەبایە

هیچ پێویستی نەبو بۆ ئێرە بهاتایە
هەستە بۆ گێلکەکەت بگەرێوە
ئەم قسانەم بۆ خەڵك بگێرەوە

«جوتیارەکە دەردەچیٚ . . . دانیشتوانی ناوشانو سەرسور دەمێننەوە . . پیاو ماقولەکان تورەدەبن . . دەنگی موسیقای نارێك دێت و قرقاش دێتە ژوریٚ بە توندی وەك رەشەبا» .

**قرقاش:** چەند کەسی دی بەختەوەر بوون بە لە سیدارەدان؟

«پیاو ماقولەك هەلدەستیٚ و هاوار دەکاو ئیشارەت بۆ سەرباز.

**دەکا:** ئەو سەربازە نەناسراوە .

هەژاری بێزخی بەرداوە
لە دژی یاسا جولاوە
ئەبیٚ لە سێدارە بدرێت

**پیاوێکی ماقولی تر:** ئەبیٚ لە سێدارە بدرێت

**قرقاش:** «بە قەشمەرییەوە» لە سیدارە بدرێت و بسوتێنرێت .

**پیاوێکی ماقولیتر:** چاکە بێنن . . سیدارە چاوەروانە .

## «دیمەنی چوارەم»

دوو کەس دێنە ژور سێدارەیان بە دەستەوەیە لە ناوەندی شانو دادنێن . . کورسیەك لە بندا دادنێن . . دوو پیاوی ماقول هێرش دەبەنە سەر سەربازەکەی و دەمی دەبەستن بەڵام ئەو بەربەرەکانیان دەکاو هاوار دەکا . . پالی پێوەدەنێن بۆ سەرکورسیەکەی . . روناکی ئامێنیٚ لەو کاتەدا دەنگی کەوتنی شتێکی گران بە سەر زەویدا دێت . . روناکی دێتەوە سیدارەو پیاوەکە نەمانە» .

**پیاو ماقولەك:** تاوان باری دیکە بێنە دەرگەوان

**دەرگەوان:** تاوان بارو پیسی تر بابێت .

«سەربازەك دێتە ژوری پیاوێکی دەست بەستی بە گوریس بە دوای خۆیدا دەکێشیٚ» .

**پیاوی ماقول:** قوربان ئەمە پیاوێکی نێرە مووکە
پێنج ژنمان بۆ هێناوە
هیچ منالی نەبووە شەمشیر بۆ تۆ هەلگریت
ئەبێ لە بەر ئەو بەختە ڕەشەی خۆی
سزای ئەو نەزوکی‌یە بدات
لەو کاتەی دوژمن زۆر دەبن

**قرقاش:** «بە پیاوە ماقوڵەکەی دەڵێ».
دادو دادکاری مەعیدەم تێکدەدا
تۆ بە ناوی من حوکم بکا
تا گەورەیی زك پربوون
یارمەتیم بدا.. بەڵکو برسی بیم..!

**پیاوی ماقوڵ:** چاکە.. ئەبێ لە سێدارە بدرێت
سێدارەی چاوەروان با بێت

«دیمـەنی ئێنـانی سێـدارە دووبـارە دەکـرێتەوەو تاوانبارەکە نێـزیکی سێـدارە دەکـرێت بەڵام ئەستوی ناگەهیتە گوریسی سێدارەو ئەو پیاوە ماقوڵەی حوکمی دای دەڵێت:

**پیاوی ماقوڵ:** ملی تاوانبار ناگاتە گوریس
چی دەفەرمووی قوربان

**قرقاش:** چاکە.. کێ لە ئێوە.. لەو درێژترە

«تـەمـاشـای دەوروبـەری دەکـات و پاشـان نیگای بە پیاو ماقولەکەی دەوستێت و دەڵێت: ـ

**قرقاش:** مادام کارەکە وای لێ هات.. خۆت تاقی کەوە..!

«تـرس ولەرز لە دەم وچاوی پیـاوە ماقـوڵـەکەی دیاردەبن و هیچ جولانەوەی ناکات.

**قرقاش:** گوێت لە فەرمانم ئەبوو
زووبە خۆت تاقی کەوە
بۆ پێشەوە.. بۆ پێشەوە
ئەبێ ئێمە حوکمان بە جێ بینین
لە سەر هەر کەسێك دا بێت.

«پیـاوی ماقـوڵ دەچێتـە بەرامبەر سیدارەو گوریس نێزیکی ئەسـتـوی دەبـێـت زیـاتـر دەلـەرزێت و قرقـاش دێت بە صەولەجانەکەی دەکاتە ئەستوی پیاوە ماقوڵەکەی‌دا».

**قرقاش:** ئەو شتێکی زۆر بە جێ‌یە
«تەماشای دەوروبەری دەکات»
چەند چاکە لەشێکی وا پاك
شۆڕ ببێتەوە بەم گوریسەدا
ئەوە شتێکی زۆر بە جێ‌یە..
وا نی‌یە...؟؟

**هەموویان:** وایە قوربان.. وایە قوربان..!

«قـرقـاش ئیشارەتی بە صەولەجانەکەی دەدات.. روناکی نامینێت دەنگی بەربـوونـەوەی شتێـك بەزەوی دێت، لە کاتی هاتنەوەی روناکی هیچ کەس لە شانودا نامینێ جگە لە قرقاش خۆی کە راکشاوە سەر عەرشەکەی.. ئەووەزیرە ریشدارەی بۆ پشکنینی ڤیـانی کوری قرقـاش و کچی میللەت چۆبـۆدێتـە ژوری کەچی قرقـاش هیچ گرینگی پەکی پێ‌نادات.. وەزیر هێدی هێدی خۆی نێزیکی قرقاش دەکات»؛

**وەزیر:** ببورە قوربان گەر ئارامیم تێکداو
هاتمە ناو خەونە خۆشەکانت
تورە مەبە گەر زەمینی تاوانم
گران کرد بە گرانی خەمان

«بە تەرەدودەوە»
هەواڵێکی گەلێك بە نرخم لەلایە
باسی دەروونی پاك و ناپاکە..
ماوەم بدە.. ئیزنم بدە

**قرقاش:** «قسەی دەبڕێ»
بەسە بلێ.. دلم گوشرا
لەگەڵ هەموو داوی ئێمە
کام خەنجەرو کام ئەژدەها
لە ناو دەرزی‌و ڕشەکانی
ئاوریشمی پر لە روناکی‌نە

**وەزیر:** ببەخشە قوربان.. چیروکم هیچ نی‌یە
دێوێکی تاوانبار دەری هێناوە

**قرقاش:** «بەتورەی یەوە»
بلێ.. نەوەك شەمشیرم بدرەوشێتەوەو

بگاتە نێوان ریش و شانەکانت.

«وەزیر ئەیەوێ قرقاشی ئارام بکات ودەستی بە ئەستوی‌یەوە دەگرێت و بە ترسەوە دەڵێت».

وەزیر: چاکە.. چاکە قوربان..! «بەشیوەی خەون».

چیروکەکی مەملەکەتێکی کۆنی لە ناو چوو

چیروکەکە دەڵێت: -

شازادەیەك لەو وڵاتە کۆنە

کچێکی هەژاری ناو میللەتی ڤیا

بەڵام باوکی.. شاهی توانا

خوایانی خەم و ئاگری هاندا

بۆ کۆشتنی بلبلی ڤیان

کەچی تا پادیشاە لە شەری

خودای خێرو بەرەکەت دوور بێت

خەرمانی بە پاسەوانەکان دا

تا ئەو کچە عاشیقە نەناسراوە بکوژن

«بە شێوەیەکی درامی»

بەڵام عاشیق خەنجەرەکەی دەرهێناو

لە ماوەیەکی کەم دا

دەمی خەنجەرو نیگای خوشەویستەکەی

برینەك لە ناوەراستی دلی‌دا پەیداکرد

«دەگەرێتەوە بۆ خەونەکەی»

چیروکەکە پێدادەچێت و دەڵێت

خەنجەرەکەی لە پاشانرا

بۆ بە داری ئازادی‌و گوڵی‌دا

«دەیەوێ‌بوەزعێکی پر ترس و هەراسان دروست کا»

چیروکەکە زیاتر پێدا دەچێت و دەڵێت:

خودای خێرو خۆشی سویندی خوارد

تۆڵەی ئەو ئەڤینە سەربراوە بستێنەوە

فەرمانی‌دا...

هەوران باڵ شۆرکەنەوە

بە سەر ئەو وڵاتە پر لە خەراپەدا

رەورەوەکانی توندی گرەو هورە نەهێڵن

گوڵ و خوشی‌و شادی

لەو وڵاتە پر دێوەدا بروێن

ئەو وڵاتە ببێتە مەڵبەندی قەڵ و کوندەبو..

«بە شێوەیەکی درامی بلند»

روبارەکان هیشك ببن

بیرەکان ئاویان نەمینێ

سەروچاوەکان بێخێر ببن

قر لە دەغڵ و ئاژەل کەوێ

پەپولەکانی ناو چیمەن

گوڵی خۆیان هەڵوەرێنن

بالندەکانی کۆچەری هەڵێن

هێلانەی کۆتر برمێن.. بروخێن

مل قوت بوونەوە.. لەش کەوتنە سەر یەك

رۆژان رویشتن یەك لە دوای یەك

ئەوجا ئەفسانەی‌تر رێك دەخرێ

«خۆی کر دەکا بۆماوەیەك.. پاشان دەڵێت»

چی دەکەی قوربان...

گەر شازادەیەك لەم وڵاتە

دڵی بداتە کچە هەژارێك

قرقاش: «بەتیزەوە»

لاشەی هەر دوو کیان بۆم بێننە ئێرە

جا با ئەو کەسەی خوای شادی و پیتە

بتوانێ تخون ئێرە بکەوێ

خوّی بدا له قەرەی هەورو گڕەی من

«وەزیر خوّی دەکێشتەوەو کڕ دەبیّ . . قرقاش نارەحەت دەبیّ» .

**قرقاش:** «هاوار دەکا»

چیت گوت . . دەلّی ی‌چی . . ؟

بیر لەوە نەکەیتەوە

خوایەکی نەزانی بیّ ئەقل و سپات

ئەتوانێت پەنجە بوّ موڵکم ببات

**وەزیر:** حاشا قوربان . . ببەخشە

من ئەوەم مەبەست نەبو بجەخشە

**قرقاش:** ئەوەت مەبەست بوو

بوّم بێنن لاشەی هەر دووکیان ئێستا

**وەزیر:** بەلّام قوربان . .

**قرقاش:** «ئاخوتنی دەبڕێت: سەرت . . یا سەری ئەوان هەر دوویان

هەر دوو خائینان . . هەر دوو صەگان .

**وەزیر:** «دەستی بە ئەستوّی‌یەوە دەگرێت»

سەری هەر دوو خائینان . . هەر دوو صەگان

«دێتە لای دەرەوەی شانوو بە دەنگێکی بلّند هەواری دەرەوە دەکات .

**وەزیر:** پیاوە ماقولّەکانی میللەت

هەژاران . . نەزانەکان

پاسەوانانی زانست و ژیری

سەربازانی دادو دادگێری

هەر ئێستا بێنن . . لاشەی هەر دووکیان

لەشی هەر دوو کیان . . سەری هەردووکیان

«لەگەل خوّیدا قسە دەکات»

با سەرم بە لەشمەوە بمینیّ . . !

«وەزیـر دێتـە نێزیك قرقاش . . بیّ دەنگیەکی ناخوش دیار دەبێت هەر دووکیـان تەمـاشـای دەرگـای شانودەکەن . . پاش کەمێـك دوو سەربـاز دێنـە ژوّر لاشـەیـەکیـان هەڵگـرتـوە . . چەرچـەفێکیان بە سەر داداوە . . بەرامبەری «قرقاش» دادەنێن دەچنـە دەرەوە . . قرقاش خوّی لە لاشەکە نێزیك دەکاتەوەو بە صەولـەجـانـەکەی جەرجەف لەسەر لاشەکەی هەلدەگرێت و تەماشای ناکات» .

**وەزیر:** ئەوە کەلاکی کچەکەیە قوربان!

«هـەر دوو سەربـازەکـە دێنـەوە ژوّریّ لاشـەیـەکی تری پیچاویان هەلگرتوە لە پێش «قرقاش» دادەنێن» .

**وەزیر:** ئەمەش لاشەی کوڕەکەیە قوربان . . !!

«قـرقـاش خوّی نێـزیـك دەکـاو جەرچـەف لە سەر چاوی هەلـدەگـرێت . بە وێنـەی پێشـەوە، کە دەبینیت . . دەمی دەکاتەوەو ئەیەویّ بکەوێت و لە خوّ بچێت» .

**قرقاش:** کوڕم . . . کوڕم . .

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

کوڕی شازەدەم

«بە وێنەیەکی هەستیری»

هەستە . . . هەستە . .

لە سەر شان و ملی مردن مەنو

«بە بلندترین دەنگ هاوار دەکا» . .

هەستە کوڕم . . گوایە گوێت لە من نی‌یە

«بەشکەستنەوە»

بەو ڕێگایەدا ڕوّیی . . گوێی لە من نەگرت

بەو ڕێگایەدا چوو . . . بوّ تاریکستان

ژنانی جیهان . . دەست کەن بە گریان

با پەری‌یەکانی دەریا بێنە دەر

لە ناو دلّان و کوّلّانەکانی ئاو

با بوّ کورم بگەڕێن . . بپشکنن

بزانن گیانی لە ناو چێ سەدەفێکا بە جێ ماوە. . ؟

با پەرییەکانی ئاسمان بفرن
بەرزبینەوە ژوورووی هەورەکان
بۆ گیانی پاکی کورم بگەڕێین

لە ناو هەورانا. . .

یا لە ناوەندی ئەستێرەکانا

«ئاگای لە خۆ دەبێتەوە کە لە وەزعێکی شکەست و بێهێزدایە بەرامبەر وەزیرەکەی. . دووبارە دەگەڕێتەوە وەزعی پێشوودا و خۆی لە وێنەی بەرزو بلندو ستەمداری‌دا دیاردەکا». .

**قرقاش:** مردن لە گەڵما قەد سەرناکەوێ
بەژنی بڵندی من نەوی ناکا
سەری بەرزی من پێدا نانەوێ
دەمی شەمشیری تیژم کول ناکا
برۆ دەرەوە ناو میللەتی کڕ
ئامادەیان کە بۆ شەڕێکی تر
. . . . . . . . . . . . . .
قەڵای وڵاتی مردن دەرمێنین
کاروانێك دیل و دەسکەوتان دێنین
سەرەو ژێر دەکەین خوای چاکەو شادی

«وەزیر خۆی ئامادە دەکات بۆ دەرچوون. . . ئاگای لە هەراو قەلەبالغێ دەبێت کە لە دەرەوەی شانو دێت ئەو و قرقاش تەماشای یەکتر دەکەن». .

**دەنگەکان:** «لەدەرەوە»:

دەریا پڕ بو
ئاو سەر ڕێژ بو
مردن ڕوخان. . مردن ڕوخان
ئێمە لاشەکەمان دەوێتەوە
تەرمەکەیمان دەوێتەوە

**دەنگێك:** تەرمی شوخی میللەتی سەربڕاو
لاشەی کچە هەژاری کوژ ڕاو

**دەنگێك:** نا. . نا ئێمە داوای لاشای قاتیلەکەی دەکەین.

**دەنگێك:** تەرمی قرقاش.

**دەنگەکان:** تەرمی ئەو. . تەرمی ئەو. . تەرمی ئەو. . .

«کۆمەڵە جوتیارێك گوڕ دەبنە ناو شانودا هەر یەکەك ئامێرەکی کشت و کالی تیژی بە دەستەوەیە. . قرقاش و وەزیرەکەی دەلەرزن لە ترسان. . قرقاش شمشیرەکەی هەڵدەکێشێ بەڵام پێش بەرزبوونەوەی جوتیاران خۆی و وەزیرەکەی تەواو دەکەن. . هیندەکیان لاشەی کورو کچە کوژ راوەکان دەبەنە دەرەوەی شانو. . ئەوانەی تر لە تەرمی قرقاش و وەزیرەکەی دەدەن و هاوار دەکەن:

**پێکەوە:** ـ دەریا پڕ بوو
ئاو سەر ڕێژ بوو
مردن. . روخان
مردن. . روخان

پاشان لاشەی هەر دووکیان بە دوای خۆیاندا دەکێشن و دەبەنە دەرەوەی شانو. .

جوتیارەك دەچێتە سەر عەرشی قرقاش دادە نیشێ وپێدەکەنێ و تەماشای خۆی دەکا. . یەکەکیان هێرش دەباو رۆژنامەکەی پارچە پارچە دەکاو فڕەی دەدا. . ئەوی تر وێنەی تەرازوی داد دەباتەوە جێگای خۆی. . بە تەواوی هەڵیدەواسێتەوە. . دەست بە شایی و سەما دەکەن لەسەر ئاوازی ئەو گۆرانییەی «قرقاش» قەدەغەی کردبوو. . دەنگی موسیقا بەرز دەبێتەوە. . جوتیاری سەر تەختی سەڵتەنەت جێگای خۆی چاك دەکات و دەست لە ڕانەکانی و بالیفەکان دەدات. . ئەوانەی لە ناو شانودان شایی دەکەن. . کۆمەڵەیەك جوتیاری‌تر دێنە ژووری شانۆ. . هاوبەشی لە شایی دەکەن. . سەربازەکان کڵاوەکانیان فڕەدەدەن و شایی دەکەن».

**جوتیارێك:** بژی شای دادگێرو دادپەروەر

**جوتیارێك:** ئێمەینە. . گەل و شاو دادگێرو دادپەروەر

**هەموویان پێکەوە:** ئێمەینە شاو دادگێر.
ئێمەینە شاو دادگێر.

پەردەی دوایی

# ئەزانم

«مەدهۆش»



هەر تۆم ئەوێ
هەر تۆم ئەوێ
تۆبتەوێ یا نەتەوێ
من تۆم ئەوێ
لە خۆمەوە ناتپەرستم

پشت بە ئەندێشە نا بەستم
ئەزانم زۆر باش ئەزانم
کە چۆن لەو دڵەت بروانم
ئەزانم چۆنت بدوێنم
ووشەت لە دەرون دەربێنم

یەکە یەکە شیی کەمەوە
وەڵامی تۆی پێ بەمەوە
هەروەك لەوەپێش زانیومە
لە شانۆی‌دەیدەتا دیومە
گەرچی بە دیمەنا سادەی
بەڵام رێ بەدڵت نادەی
وەك سەرپشتێکی هەرزەکار
ئارەزوی خۆت بخەیتە کار
ئەزانم زۆر باش ئەزانم
کە چۆن لەو دڵەت بروانم
ئەتەوێ هەروا بمێنی
تا مەبەستی خۆت پێك دێنی
ئەزانم حەز لە چۆن ئەکەی
چە جۆرە گوڵێ بۆن ئەکەی
کات و شوێن و کێت پێ خۆشە
دڵت بۆچی بە پەرۆشە
کام بەزم و هاو دەمت ئەوێ
لەگەڵ دەرونت رێك کەوێ
ئەمجا پاش ئەم بەراوردە
لەگەڵ ئەم سەرنجە وردە
باش گەیشتوم بەو بڕوایە
هەر خۆم ئەو مەرجانەم تیایە
لای تۆ پەسەندو رەوابێ،
شێوەی هەستێکی باڵابێ
پشت ئەستورم لەخۆم لەوە
کە بە درۆ نا کەومەوە
رۆژێك دێ پێم ئەڵێی زۆرزان
ئازانە منت خەڵەتان
پێت ئەڵێم نەمخەڵەتانوی
بە دڵی خۆتم گەیانوی

پەخشانە شیعر:



# ڕەنج بێوەر خۆم.. دایە

ئەکرم محمود سەمین

«بۆ شێخ حەسیبی شاعیری
جگەر سووتاو..»

(1)

دایەگیان...
شەپۆلی ئەلوەن لێم ئەپرسێ
بێ دەنگی شەوانم
گوڵی زەردو سووری لووتکەی بەمۆ[1]
گوڵی وەنەوشەی ئاخ و داخ[2]
دەشت و دەرو شاخی بەفرینی قەراخ
هەموو شتێکی جوان و قەشەنگ لەم ولاتە
لێم ئەپرسن...
بۆچی دەژی؟

بۆکێ دەژی؟
بۆچی ماوی؟
چاوەروانی کێ‌ی؟
ئاور ئەدەمەوە لەخۆم ئەپرسم..
بۆچی ئەشکەوت شوێنم بێ؟
بۆچی شاخ و داخ جێگەم بێ؟
بۆچی کەناری دەریا ڕێگام بێ؟
لەبەرچی ئەم گەشتە دوور درێژەم لەبەر بێ؟
لەبەر چی‌یە وون بوونم؟



(2)

پیرێ شەو دایە لە خەوما دیتم . .

بۆم باس کردی . .

دایەگیان . .

رۆژێ لە رۆژان جەلاد توورە بوو ووتی :

خودا ئەم نهێنیە چی بێ باشە . .

هەرچەندە پیاو ئەکوژم فرەتر ئەبن . .

کاتێ ئەیانکوژم خۆم نامێنم . .

★★★

(3)

دایەی شیرینم

دانە قەزوانێکی سەوزی هەورامان

دلۆپە ئاوێکی سپی لە سیروان

لەتە نانێکی گەرمی هەژاران

پارچە کلوێکی سوور لە شاخان

خۆشیانم ئەوێ . .

زۆر شتی تری وەهام خۆش ئەوێ . .

کاتێ بیرت لێ ئەکەمەوە

گوڵی خۆشەویستی بۆ ئەو وڵاتەم ئەروێنم

کە منی مرۆڤ تیادا لە دایك بووم . .

★★★

(4)

دایەگیان . . .

ـ ئەبێ چیبکەم بۆ نیشتمان

ـ برام مرد . .

ـ رۆڵە گیان ئەبێ هەر بەردەوام بیت لە کاروان . .

(5)

دایەگیان . . .

باسێکم هەیە . .

بۆتی ئەگێرمەوە . .

لە چاوپێکەوتنێکدا یەکترمان دی.

خۆشم ویست و خۆشی ویستم

هیدی . . . هیدی . . .

یەکترمان کری . .

پاشان ئەو ووتی :

ـ چاوەروان بە . . کە دیمەوە . . . دوایی رۆیشت

چاوەرێم نەکرد . . ئەویش نەهات

رووداوێکی وەك مردن بوو

بەڵام کەسمان نەمردین

1 ـ شاخێکی گەورەی ناوچەی خانەقینە .

2 ـ دیسان شاخێکی تری ناوچەی خانەقینە .

# نامەیەك ... بۆیارامن

● هشیار محمد رێكانی ●



هۆیارا من . .
من تۆ دیتی و تۆ چاڤدای ،
ئەڤینا تە خۆل نیڤا دلّی من دا . .
هێلین و لیس لێ چێکرن .
جوانیا بەژن و بالا تە . . نێچیرکرم !
دەما پەیڤێد جوان و شرین . .
ژلیڤە هنگڤینێد تە . . ڤەدپەشین !
ئەز مەست و سەرگەردان کرم .
ل ناڤ دەریا ئەڤیناتە . .
وەك ماسیەکا نەمەلەڤان !!
یا دەرمان دای . .
سیپەلێد وێ نوقۆکرم . . بۆخۆ بوم
تیرێژێد هەردوو چاڤێد تە . .
بێ هێز کرم . .
هنگافتم . . بریندار کرم .
دێمێ تەیێ سۆر و سپی . .
خۆدیکە . . ڕۆژە . . چرایە . .
ژ بەر تێهن و ڕۆناهیاتە !!
چ نەما . . وەك بەلاتینکا ،
ئەز بمرم .
جارەکادی من تۆ دیتی . .
ژنوی چاڤێد من کارین تە ببینن
ڕۆندکێد شادی و ئەڤینێ . . ببارینن !
من نەزانی . .
چەوا سەرێ بابەتی بۆتە ئەز ڤەکەم ؟
ئەڤینی یا ل ناڤ دلێ من پەنگیای . .
شرۆڤەکەم !
جارەکادی و گەلەك جارا . .
من تۆ دیتی و تە دبینم .
من نامەیەك بۆتە هنارت . . .
بخوینا خۆ نڤیسی بوو :-
«یارێ ڕۆژ باش . .

جوانترین رێزو سلاڤ ،
بۆ تە ئەی بیناهیا چاڤا .
من تۆ دڤێی . . بۆ تە دژیم
بەنیمە تە دپەرێسم
دەرگێ دلێ دائێخستی . . بۆ من ڤەکە .
رۆژ و سالێد ژینێ کورتن !
لەورا من ژتە دڤێتن . .
زویترین دەم . . بەرسڤا ناما من بدەی
نزانم ژڤێ پێڤەتر . . چ بنڤیسم ؟
پێنووس ل ناڤ دەستێ من دا خۆ ناگریت . . دلەرزیت!!
ئەز نزانم . . دێ بەرسڤا تە چ بیتن ؟
دلێ من دێ ئاڤاکەی ئان هەرفینی !
ژ یانامن دێ نویکەی ئان پەرچقینی !
تۆ هۆستایا دلێ منی .
دان و ستاندن . .
ئاڤاکرن و پەلخاندن ،
ڤیان ڤەژین و مراندن . . .

کلیلا وان دەستێ تەیە ،
ئاڤریەکا چاڤێ تەیە .
گەر ئەز بێژم :
(تۆ ئێکەمین ئەڤینداری . . من تۆ ڤیای)
تۆ چ جارا باوەر ناکەی . .
چونکو ئەڤینی‌یا نوکە . . خاپاندنە
نەراستە، درەوە، حەنەك و یارینە
ئەڤینا پاقژ یاکێمە
باوەر نەکە . . ئەز نە ل نفشێ وانامە !
چونکو ئەز تە نا خاپینم
من دڤێ تۆ ببی هەڤژینا دلێ من
گە ببێژی هێشتا زوی‌یە . .
ئەز بەرهەڤم . .
ل ژڤانا تە بمینم . . تەنیا من بێ هیڤی نەکە !
ئێدی هەر بمینی دلشاد

هەر سەرکەڤتی بی سەرفەراز
سەربەست بژی . . بگرنژی ،
یارێ چما . . ؟
پشتی تە نامە ڤە خواندی . .
تە هیڤی ل ناڤ دلێ من دا مراندی !
وەکی دارەکا بێ ئاڤ بەلگ لێ وەراندی !!
ما تۆ زێری دێ تە فرۆشن و کرن
ماتۆ کراسی دێ تە ل بەر بەژنێ کەن . . وهاڤێژ ن .
تۆ مرۆڤی . . خودان مافی !
هە ڤژینێ خۆ هەلبژێرە
ما چەوا تە ئێك نەڤێتن ؟
ل دویڤ رژێم و نەرێتێد کەڤن و بەرێ . .
دێ تە خوازن . . دێ تە دەنێ . . ڤەگوهێزن !!
رابە راوەستە سەر پی‌یا ،
ب دلێری گازی بکە . .
بێژە وانا :-
(من نەڤێتن . .
گەر هوین من و وی ڤەکوژ ن !
گوشتێ مە پێکڤە قیمەکەن . .
بهنجنن !!
بێ من دێ خۆ ژ ێ ڤەدەرکەت . .
ژێ جودا بیت !)
ئەڤجا یارێ . .
رابە دلێ من دەرمانکە
باش بزانە . .
دەرمانێ ئێشا دلێ من ،
بوشکورینا لێڤێد تەیە
ویەیڤەکا شرینا ئەزمانێ تەیە . . . . . .



● شیعری: محمد حسین هەڵەبجەیی ●

# پەیوەندی غەم

ئەم شەوغەمێ
لە نێو دڵما سەری هەڵدا
بە ناو خوێنما ئەهات. . ئەچوو
تاکو بیرو. . مێشکم بخوا

★★★

ئەم شەو،
ئەم غەمەم. . زۆر ڕەشە
ڕەشەو وەکو شەوی زستان
ئەم غەمەم هێجگار درێژە
وەکو شەوی «یەڵدا»ی [1] پایز
ئەی غەمی ڕەش و درێژم
زوو بگەرە «دڵە»ی ئازیز

★★★

ئەو ڕۆژەی کە بەجێت
هێشتم
نەهاتە ساڵی فرمێسک بوو
کۆمەڵێ ووشەت پێ ڕشتم
ئەی غەریبی بێکەس،
بێ باوک. . بێ برا
لە دیدەو بینایی مندا
بوویتە چرا. .
دەهەواڵێ، دەنگێ، باسێ
بنێرە بۆ دیدەکانم. .
با ئەو چرایەی هەڵت کرد
لە چاوما. . نەکوژێتەوە
با تاسەت نەبێتە غەم و،
نەڕوێن لەسەر پەنجەکانم.

(1) یەڵدا: درێژترین شەوی پایزە

پەخشان

# کەژاوەو هانا



● ئومێد ئاشنا ●

**«کەژاوە»**

کە هاتنت لەسەر ئەم زەوییە دەبێتە خەیاڵ وخەو چاوەڕێ دەکەم لە ئاسمانەوە ، لە نێوان ئەستێرەکانەوە کەژاوەت دابەزێ کە ئاوا بویت شەوت بەمن سپارد، ژیان لەگەڵ ئەم شەوەدا

چەند ناخۆشە ئێستا کە من بۆ تاریکی دەژیم تۆ سەرڕاوەی ڕوناکیت پەنجەم دەبێ بەشانەو دەچێتە قژی پر لە عەترتەوە .

کە ئاوابویت شەوت بەمن سپارد ، ژیان لەگەڵ ئەم شەوەدا چەندە ناخۆشە کە پەنجەکانت دەتەزن گۆگانت سوور هەڵ دەگەڕێ نهێنێ ئەم دنیایەم پێ بسپێرە ، شەوان بە ئارامی بچۆرە خەوی دڵ نیاییەوە .

خۆت ئەستێرەت کوژاندەوە ، تروسکەیەك بخەرە دڵێ شەوەوە ئێستاشەو هی منە ، شەو ئەستێرەکان کوژاونەتەوە ، بۆ نابێتە چراخانی ئاسمان؟!

بیر لە تاریکی چاوی ئە ستێرەکان ناکەیتەوە ، لە ژێر باڵمدا لە بەری ئاسمان دەت پارێزم کە هاتی ، بۆ باوەشێکی ئارام ، ماچێکی گەرم ڕووناکی . دێنی من نهێنیەکانت لە سنگما دەشارمەوە ، ئاواتەکانت بۆ دنیایەکی نوێ دەژ یەنمەوە .

**«هانا»**

بۆیە چاوەکانی خۆم خۆش دەوێ هەموو ڕۆژ وێنەی تۆ دەچێتە بیلبیلەکانیەوە . لە سەرەتای ئەم بەهارەدا لە پێکەنینەکەتا خەمی نەورۆز دیارە چەندە دووری لێمەوە چنارەکانی ی کەنار ڕێگاکان بەشێك لە لەنجەی تۆیان تێدایە گڕی مۆمێکی تر دادە گیرسێنی نەورۆزێکی بەهارێکی نوێت پێیە . ناشارەزا دەسووڕێمەوە کە دەڵێن لەو پەری دنیاوە جێ گیر بوی سواری ئەسپی با دەبم و دەگەمەلات .

ڕوناکیەك لەوپەری جیهانەوە دیارە ، ئەسپەکەم بەدی دەکات کاتێ لە شەرابی روانینەکانت دەخۆمەوە جێ ژوانمان باخچەیەکە تۆ دیاریی بەهاری تۆ نەورۆزی دڵدارەکانی شاری دووریت لە هەناسەیەکی سارد زیاترە دووریت خەمی کاروانێکە بەفر دەی تەزێنێ لە دووریتا دەنگی دڵم ساوایەکە برسێتی بیگریەنێ ، زمانی نەگرتبێ و نەتوانێ برسێتی خۆی بەکەس بگەیەنێ .

برژانگەکانت زۆر نزیکن لێتەوە ، هاورێ کانت زۆریان خۆش دەوێی ، بەجێت ناهێڵن لە تەکتا دێن ودەچن جریوەی ئەستێرەیەکی دووریو هانام ناتگاتێ .

# سێ هەڤاڵ

لەکتێبی (زارگوتنا کوردی) جەلیلی جەلیل و
جاسمی جەلیل



● شکور مصطفی ●

سێ مەری خوەڕا بوونە هەڤاڵێ هەڤ، کەتنە ڕێ، لێدان چوون. عەمرێ خوەدێ بوو عەور، ئاڤێ بارانێ گرت. قەیەك کەتە پێشیێ، خوە دانە بەر قەیێ، گۆ «حەتا باران ڤەدکە، ئاڤێ دەرباز دبە، ئەمێ لێخن، هەڕن».

ئەڤان خوە دا بەر قەیێ، قەیا لێ هاتە هەڤ، لێ هاتە هەڤ هەرسێکا هەڤ.

نهێری، «کوڕۆ، ـ گۆ، ـ کێ مە گونەکارە؟ کا گونەکاریا کێ مە هەیە ئەم مانە ڤرادا؟».

یەکی گۆ: «حەیران، گونێ من کری، ـ گۆ، باڤێ من نەخاش بوو، زڤستان بووە، گۆ، ئاڤێ بووز دخواست، گۆ، ئەز حەتا چوومە سەر ئاڤێ، م ئاڤێ، بووز باڤێ خوەڕا ئانی. باڤێ من ڕازابوو، گۆ من تاس دا سەر دەستێ خوە، م دەین لێ نەکر. گۆ من تاس دا سەر دەستێ خوە، ئەز بەر باڤێ خوە سەکنیم، کەنگێ چەعڤێ، خوە ڤەکر ئەز ئاڤێ بدمێ. گۆ ئەز سەکنیم، باڤێ من چەعڤێ خوە ڤەکر، م ئاڤ دا دێست، گۆ، چەرمێ دەستێ من تاسیێ ڕابوو. دەستێ من سوڕێ بر، گۆ، گونەکاریا م کری م



ئاڤ دەرەنگێ دا باڤێ خوە». «کورۆ، ـ گۆ، ـ مال نەخراب، ئەو چبوو؟ ئەو گونەکاری نینە. باڤۆ، گونەکاری‌یا منە»، ـ «ئێ، ـ گۆ، ـ گونێ من ئەوە»°. هنەکی بوو رووناییێ ئیدی هەڤ دیتن. «کورۆ، ـ گۆ، ـ وەکی ئوسانە گونەکار ئەم هەردن».

یەکی گۆ: «حەیران، گونێ من کری، ئەز گونێ خوە بێژم زەڤی‌یا من، گۆ، جیێ چل پالایی بوو. گۆ، وەکی زەڤی‌یا من شین دبوو م چل پالە گەرە هلدا بڤرا کەڤی‌یا خوە بڕوویا، چ زەڤی‌یا م بما، سبێ پالە چ بچاندا دمر. ئەز گەری‌یام، من سی نەهـ پالە بەزڤ کرن یەك کێم بوو. یەك کێم بوو، دە، تونەبوو. ئەز سبێ زوو رابووم پێشی‌یا پالێ خوە کەتم، گۆ، دە چ ژ زەڤی‌یێ دمینە برا بمینە. ئەز چوومە ناڤ زەڤی‌یا خوە، پالێ من زەڤی‌یا خوە دروون. بوو چاخێ تاشتێ، گۆ، زڤرینە، نان دخون. رێ بەر زەڤی‌یا مرا دچوو. م دینا خوە دایێ. مەریك دەعسەك دەستدا هات، دەرباز بە. ئەز چوومە پێشی‌یێ. «قوربان، تو پالایی؟» گۆ: «ئەرێ». ـ «قوربان»، ـ گۆ، ـ وەکی تو پالایی ئیرۆ وەرە تەڤ ڤان پالێ من بخڤنە. ئەز چ بدمە تە؟» گۆتێ: «چ دایە ڤان پالا بدە من». گۆ: ئەزێ قاسی ڤان پالا ژی بدمە تە». ـ چما حەیران، ـ گۆ، ـ ئەڤا ئیدی نیڤرۆیە». گۆ: نا، گۆ، نا ئەزێ بدمە تە». ـ گۆ: «ئەوێ ئیدی تو زانی». ئانی هات دا روونشتاندن، گۆ دە، پالا دەعسێ خوە تووژ کری‌یە، چقارێ خوە کشاندی‌یە، خوەرا خەڤەردا، گۆ: «دە وەرە نێن بخوە». گۆ: «نا، ئەز نانێ تە ناخوم». ـ «چما؟» گۆت: «ئەز نەرا نەخەڤتیمە، ئەڤان خەڤتینە نانێ تە خارنە، ئەز ناخوم». گۆم کر ـ نەکر ئەڤ مەرڤی نان نەخار، گۆ، پالا رابوون. م دێنا خوە داوییا، ئەو قاسی دوو پالا دروروت. ما حەتا نیڤرۆ، گۆ، نانێ پالا هات، چوو سەر ـ چەعڤێ خوە شوشت هاتە روونشت: «ئا، ـ گۆ، ـ ئیدی نانێ تە م حەلالە، ئەزێ هێژا نانێ تە بخوم». گۆ، نانێ من خار، ئەم رابوون مە دروو. هێ زوو زەڤی‌یا من خلاس بوو. گۆ، زەڤی‌یا من خلاس بوو ناکا هەقێ وی با من تونە ئەز بدمێ. گۆ: «قوربان، ئیشەڤ وەرە مالا من، نانێ من بخوە، ئاڤا من بخوە، سبێ رابە هەرە». گۆ: «حەیران، هەرگێ خەباتا تە هەیە تو سبێ تێ م بدی خەباتێ ئەزێ بێم»، ـ «نا، ـ گۆ ـ حەیران، خەباتا من تونە». ـ «ئا، ـ گۆ، ـ ئەزێ هەرم گوندێ هافی پێشڤا، خوەرا مشتەریکێ بڤینم، ئەز پالامە، ئەزێ خوەرا بخەبتم». گۆ، م هەقێ وی نەدایێ. ئەو مەرڤ لێدا چوو. قەرەز لێدا چوو، گۆ، م نانێ خوە ئانی، م چاکر نەهات. م هەقێ وی دا کارەکێ، گۆ، م ئەو کار بەردا ناڤ پەزێ خوە. بەهارێ کارا وی زا. گۆ، کارا وی زا، بوونە دوودا، گۆ، منێ ئاڤێتە سەر پەزێ خوە، چارپە زێ من هەنە هاقا رۆژ من شیرێ وانا بۆنا وێ کارێ دا وی، گۆ، ب شیرێ وێ، ئەوا وێ پەزی‌یێ م یەکە دنێ ژی کری. گۆ، م یەکە دنێ ژی کری، گۆ، ئوسا هەڤ زێدە بوون. پێنج سالا، گۆ، نەهات. پێنج سالا، گۆ، هەڤێ وی ما ئوسا سەر من نەهات. گۆ، من مالێ وی ئوسا ناڤ مالێ خوەدا خوەی کر، ئوسا ئوسا زێدەکر.

وەختەکی، گۆ، بهارە، من دینا خوە دایێ یەك وێ پرسا مالا م دکە، «کورۆ، ـ گۆ، ـ ئەو کی‌یە؟» چوومە پێشی‌یێ» قوربان، گۆ، وەرە، تو کێ‌یی؟» دە پێنج سال کەتبوو ئۆرقێ، «کورۆ، توکێ‌یی؟ تو پرسا کێ دکی؟» گۆ: , «ئەز پرسا فلان مالێ دکم». م گۆ: «وەرە، وەرە ئەز نیشانی تە کم. کورۆ، گۆ، ئەز تە ناس ناکم، تو کی‌یی؟» «قوربا گۆ، ئەز رۆژکی وی مەریرا خەڤتیمە، ئیسال پێنج سالە، ئەز هاتمە هەقێ خوە»، ـ «ها، کورۆ، تویی؟» گۆ: «ئەرێ»، ـ «دە وەرە، وەرە»، گۆ، برە مالا خوە، حەتا نیڤرۆ من نەهشت هەرە، حەتا نیڤرۆ پەز هات. من پەزێ وی، بزنێ وی ڤەقەتاندن، بوویە کەریکی، گۆ: «ئاها، حەیران، ئەڤا هەقێ تە لێخە هەرە». ـ «حەیران، ـ گۆت، ـ تو م شادبی؟ ترانە م دکی؟ تو چ دکی؟ ئەڤا هەقێ منە؟» ـ کورۆ، ـ گۆ، هەقێ خوە ناڤ دەولەتا من دەرخە هەرە، ئیسال پێنج سالە تە ئانی‌یە کری‌یە ناڤ دەولەتا من»، گۆ، وەللە، حەیران، نە هەڤی‌یا من کری، خرابی‌یا من کری، گۆ، من هەقێ وی دەرەنگێ داییدا».

قەیا هێ ڤەبوو، ئیدی هەڤ دیتن.

دنیا خوە دانێ بێ سسیا خوە قولچەکێ کری‌یە، «ئا، کورۆ، ـ گۆ، ـ چ گونە هەبە بێ وی‌یە، گۆ، گونێ مە تونە».

حەیران، ـ گۆ، ـ ئیژا ئەزێ گونێ خوە بێژم. گۆ، مالا باڤێ من دەولەتی بوو. نانێ گوند خلاس ببوو، چاخێ گهێو نان درووتنێ بوو. گۆ، چەعلکە باڤێ من هەبوو، تژی نان بوو، گوندی هاتنە با باڤێ من، گۆ: «گەرە فلان کەس، تو ئەڤێ چەعلا خوە دەری ڤەکی، نێن بدی مە. گۆ، هم نانێ تە

تەزە دبە، هەم قەنجی‌یا تە دکەڤە سەر مە گۆ، وەختا مە نانێ خوە درووئانی بێدەرێ، گۆ، ئەمێ خوە خوە بدنە پشتا خوە بینن تێنە چەعلا تە». باڤێ من دەڤێ چەعلێ ڤەکر، نان دا خەلقێ. ئەز کەتمە چەعلێ. لێ گونددا دلێ من زەعف بووکا یەکێدا هەبوو. م دکر ـ نەدەکر ئەو بووك مرا ڕاست نەدبوو. گۆ، م گۆ: «باڤۆ، نێن نەدە وێ مالێ حەتا بووکا وانا تێ». قەرەز، گۆ، نان نەدانە وانا، مالخێ مالێ هات، کەڤانی هات، کێ هات نەدانێ... گۆ: درگەرە بووکا تە بێ!» گۆ، بووك هاتە سەر دەڤێ چەعلێ، «باڤۆ، ـ گۆ، ـ تە نان دا خەلقێ تو چما نێن نادی مە؟» ـ «ئێ خوشکێ، ـ گۆ، ـ تو تەزە هاتی». گۆ، خرابی‌یا م کری، گۆ، بنهێر سەر دەڤێ چەعلێ ئەز ئەو بوونە خوشك برێ هەڤ. من نان دەرەنگ داییدا. م نان دا حەموویا، نەدا وێ».

دەری لێ ڤەبوو. دەری ڤەبوو، هەرسێ ڕابوون، دانە سەر ڕییا خوە لێدان چوون.

## فەرهەنگۆك

هەڤ: یەك، یەکتر
قەیە: قایە، گابەرد، کەرتەتاخ
لێ‌هاتەهەڤ: داخرا
ئهێرین: نوارین، ڕووانین
بووز: سەهۆل، شەختە، بەفر
ڕازان: نووستن
دەین لێ‌کر: زەینی پێوە دایە، دقەتم کرد
ڤەکر: کردیەوە
چەعڤ: چاو
دێست: دەست
ڕابوو: هەڵسا
سوری‌بر: سڕبوو
گونێ: گوناح
کەڤی: د،ەغڵ
بڤرا: بیردبا
بەرەڤ کرن: بڵاوکردەوە
برا: بلا، با
چاخێ: کاتێ
تاشتێ: چێشتان
تەڤ ڤان: لای‌ئەوان
ئەرێ: بەڵێ
بخڤتە: بختبە، خەبات بکا، بکۆشێ، کاربکا، ئیش بکا
نیڤرۆ: نیوەڕۆ
ڕوونشتاندن: دانیشتاندن
دەعـی: داس
تووژ: تیژ
چقارێ: جفارە، جگەرە
نێن: نان
نان: گەنم، خەلەودان
دێن: زەین، بیر
تونە: نیە
هانێ: هۆوە، ئەوێ‌هێ
دوودا: دوو
سیسیا: سێ
هاق: ئەوەندە، هێندە
کار: کاری‌بزن
دن: تر، دیکە، دی
ئوسا: ئەوها، وا
خوەی‌کر: بەخێوکرد
ئۆرتێ: ناوەند، نێوان
هەرە: بروا
لێخە: لێدە
دەولەت: سەرووەت و سامان
قولچەك کرن: خوگرمۆڵە کردن
ئیژا: ئەوجا، ئینجا
گهێ: گیا
قەنجی: چاکە
قەرەز: کابرا

# پێکەکا دی ژ دەریایا دەولەمەندا سترانێت کوردی

**ڕێکێش ئامێدی**

ئەرێ. . ێ. . ێ هەرێ مامو ئەز بخودێ کەم تەشابەت سەرێ من دگریت گاڤا ئەز پیچەك گەمیا خویا. بچیك دبەمە ناڤ دەریا تورێ کوردی ئەف دەریا هوسا یا مشت وتژ ی ستران و لاڤژەو هوزان و ستایشێت ئولی و بەیت و سەرهاتی و مەتلوك و. . و. . هتد.

پەلێ پا دسەر هێندیرا ئەز گەلەك خەمێ دخۆم گاڤا ئەز دبینم ئەف دەریایا هویا مەزن و بەر دریای یا مایە بێ گەمیڤان.

ئەرێ مانە خەم ساریە کو مەلەڤانێت ڤێ دەریایێ هەتا ئەڤرو بهژمارا تبلێت دەستینە بەلکو هندەك هەبن هزر بکەن کو ئاڤا ڤێ دەریایێ یا کێمە نە هندا بوشە بەلێ پا ئەز بسەرێ کاوێ دلێر کەم چەوا پانقێت ئەمریکان و کوێت و سویسرای دپری پارەوز یرن ئەڤ دەریایە هێشتا دەولەمەندترە بستران و لاڤژا و. . . هتد.

بەلێ ئەز دبێژم جهێ ئاخ و ئوفایە کو مروڤ دبینیت نوت و پێنج ژسەدێ ژکورا و نوت و هەشت ژسەدێ ژکچا پاتکا خویا دایە ڤی تشتی گەمیاخوتە هاڤێتیە ڤێ دەریایێ و بێ خو بهندەك تشتێت ددیڤە مژیل دکەن ئو هەما ژ بنیرا بەرێ خونادەنە خاندن و نڤیسینا چ تشتا بەس پا دێ روژەك هێتن ئەف کەسە باش دێ پێشەمانبن.

ئو ژلایەکێ دیڤە دێ بینین هندەك تورەڤان یێت رابوین بەرێ گەمیا خو یا دایە دەریاریێت بیانی و پاتکا خو (بشتا خو) یا دایە دەریایا تورێ کوردی بێ خوتەرخان کری ژ بو خزمەتا هندەك ئەزمانێت دی هەر چەندە خودانێت وا ئەزمانێت بیانی خو منەتا پێشکێلە بڤا کەسا نینە.

**ئوگەر تو پسیارێ ژی ژڤا کەسا بکەی تو بوچی بزمانێ خو نا نڤیسی؟ دێ بێژیت مانێ ئەز چ ژخاندن و نڤیسینا کوردی نزا' بەلێ یا ئەز دبێژم ئەڤە هەجەتە وا بدەڤێ خو گرتی ئەرێ م' ەز چ مەجبورم دەرێ خانێ خو بخانیەکێ بیانی ڤەنم ڤێی هندی ئەف کەسە هەجەتا بگرن نك من ئەف تشتە وەنینەو دگوهێت من دا ناچیتە خارێ هەر چەندە هندەك دێ بڤا گوتنێت مە تورەبن بەلێ پا بلا من یا خو هەر گوتن.**

**دێ بابو ئەز هند ڤێ سوحبەتا بێ دیماهی درێژناکەم و ئەز ڤێ سترانا کو بسەرێ شوکا من ڤەهاتی دکەمە دیاری بو خاندەڤا ئو ئەگەر کێماسیەك تێدا هەبیت ڤێ سترانێ هیڤدارم لمن ببورن چونکی هێشتا ئەز نەبیمە مەلەڤانەکێ چاك ددەریایا فلکلورێ کوردیدا ئەز سترانا «ئێمێ» بدو رەنگا بو خاندەڤانا دکەمە دیاری.**

## - ئیمێ -

ئیمێ تە مەدرومێ
تە مەحرومێ ئەنی دەقێ
گوهار شورێ کەردەن کێلێ
کەپ زیرینێ
هەی بقامێ نازکێ تەنکێ
شلکێ خشکوکێ نازکێ
نازدارێ پەریکێ حوریکێ
مال خرابێ بخودێ بەس
ڕەبێ عالەمێ دزانیت چەند شرینێ
ئاخ ئیمێ سوبەیە
ئەزێ لڤێ دونیایێ دلێمن دلەکێ
دل شکییە ئەز بخودێ
وەز شێخ موسێ عەلی بەگێمە
خەلکێ باژێرێ موشێمە
تجارێ دورا دنێمە
دەستێ خو هاڤێت دوربینەکا جەرمەنیا
بەلێ لباژێرێ مالاخو بستانێ
لباژێرێ موشێ تێم قەستا
باژێرێ تلخمسێ ژمال بابا ئێما
حەمومن کرییە
بەرێ خو ددەمێ داوەتەك و
دیلانەکا گران لێ دگەرییە
ئەو داوەتا هەنێ
نە لسەرییە
نە لبنی‌یە نە لپەرییە
نە لناڤا باژێرییە
بخودێ سێ کچکا گرتی
هەرسێ خیشکێت ئێکێت دایبابینە
هەرسێ کچك منێ پسیارکری
ژدینێ خودا ئێزدینە
منێ بەرێ خودایێ
لگەرا گوڤەندێ وەکی خو
دهژینن خو دلەقینن
دێ بێژی بخودێ هەستی
دقالبێ وادا نینە
نازکن نازدارن تەنکن شلکن
پەریکن ڕەبێ عالەمێ هەما
دگەل فەتیلەکا بەفرێ دارێتینە
سێ چپکێت خاڤە خوینێ
مەجبوری ددلێ مندا ڤەرەستینە
ئەو دەرکێ مەجبورێ لمن ڤەبو
بخودێ ما بەینا دوو کچکا لێك ڤەکر
سەرێ لێك دوور خستینە
وڵلا بێهنا مەمکێ وان
مسکێت عەمبەرێ زەحفەرێ کەسبەرێ
خەزەرێ هێلێ دارچینێ قەلەفلێ
بجارەکێ بێنەکا مەزن لێ ڤرییە
من گوت ڕەبێ تەعالا
خودێ دزانیت ئەڤە بێنا حەدیقێت
کەوسەرێ یا جەنەتا باقییە
ئێدی لوێ جارێ تفنا (دفنا) من
نەراگرتی من سەرێ خو ژڤراندی
بەرێ من کەفتە وا دەستێ من
یا مەزن ڕەش ڕەشە متربە وەك زەرییە
من دەستێ وێ بەردا چومە دەستێ
یا ناڤێ هندا جوان بوگەلەکا درێژ بو
سپێدێ هەتا بانگێ نیڤرو من ددەستێ وێ
داوەت کری من جەمەدانیا سەری نە دیتییە
وەکی چوومە دەستێ یا کچکوك نازکە نازدارە
تەنکە شلکە خشکوکە نازکە
نازەلینە پەریکە حوریکە

ب ڕەبێ عالەمێ من بەرێ‌خو دایێ
نەی کورتە نەی درێژە بخودێ
لدنیایێ قایدێ بەژنا منە ناڤنجییە
ئەو سەر بشکوژا مەمکا بزمارییە
بنێ مەمکا سێڤێت سوریێت ئەمریکییە
بخودێ قڕا گەردەنێ بەفرێ زوزانا ترکییە
بەژنا وێ سپیندارەکا ئەمریکی
گرێ تێدا نییە
هەوارا من بخودێ گەلەکا نازك و
نازدارە شرینترە ژهنگڤینێ
شلخێ زوزانێ ژورییە
وەکی من دەستێ خو هاڤێتە
دەستێ وێ لگەرا گوڤەندێ
من گرت و هژاندییە
بخودێ وێ گاڤێ نێ داوەت و . .
دیلان هەمیا داوەت بەتال کر
تەماشەی من و ئێمێ کرییە
بەلێ منێ بەرێ خو دایێ
وێ گاڤێ ئەو متربێ مال میرات
بهەردوو ملا دارێ خو بزکێ خو
دادابو دەهول و زڕنا ژ بیرکرییە
هەوارا من خودێ
منێ بەرێ خو دایێ
ئەڤ زڕنا بێژێ مال میرات
. . . . . . . . . . . . . گرییە
بەلێ بخودێ دەهول و زڕنا
هەر دووکا ژ بیرکرییە
من دەستێ خو برە بنێ . .
بەریکا خو حسێبا زێرا
من نەزانییە
بەس دترسم پیچەك بن
من شەرمکر سەر سەرێ . .

ئێمێ شەباشە من
هاڤێتنە دەهولا متربییە
ئەوێ گاڤێ متربێ مال میرات
بیرا وی هاتی
وەرگێرایە تایەکێ عەرەبییە
بخودێ چوکێ من و ئێما حەموی
دگەل ئێکدا فشیابییە
سینکێ مە ڤێك کەفتیە
وەکی من دەستێ خو ڤەکێشا
بجوت مەمکێ ئێمێ کەفتی
سەربشکوژا مەمکا تیژ بو
خەنجەرێ دەبانی سەرێ سێ . .
تقلێت من فراندییە
هەوارا من خودێ
قەلبێ وێ نازکە نازدارە بێ هەستی‌یە
مامە دلگرتی سەر تلیکێ . .
ئێما خودا وەس کەتییە
بخودێ تلیکێ وێ هەستی تێدا نەبو
مەیتێ من گەلەکێ گران بۆ
ئەزێ بناڤا وی مەخلوقاتی
بخڕۆ خوینێ گەڤزی بوم
بومە مروڤەکێ دلگرتییە
ڕەبێ عالەمێ ل مەیتێ منرا
بۆحڕنگێن و پێ کەنییە
ئێمێ هەی دەردا بێ دەرمان
هەی کولا بێ سەری
وەی ئێشا زراڤ
هەی مەرەدا سللێ
گرێکا مرنێ هەی کولکا پەجە شێرێ
عەجێبا کەس نەدیت
کول و کوڤان و پرسکا زمانێ من
ملحمەما هەمو برینێت من

لو ئاخ دەلێ لێ لێ ئێمێ
ئاخ وڵلا ئێمێ
مالا بابێ‌تە نە خرابێ
بخودێ چارێکا سەعەتێ مامە دلگرتییە
ئەو چارێکا سەعەتێ پێدا
ئەز هشیار بوم سەرێ من
سەر چوکەکێ نازکێ نازدارێ
تەنکێ شلکێ نازەلینە سورو سپییە
دێ بێژی بەفرو خوینە
تێك هەل بییە
بخودێ هەستیکەك دوی رانیدا نییە
سەرێ من سەر دا نییە
بەرێ خو ددەمێ هنداڤی چاڤێ من
ملەکێ کەزیو بسکا بەردای
وەکی داڤسکێ ئارمیشێ ئەڵمانییە
بخودێ بو من کرە کەپرە شینەکا هاڤینیە
رەبێ تەعالا پێ دزانیت زەندێ وێ
شیشەیەو تلێ وێ خیارێ قەلەمبەگی‌یە
کەفیا بەر دەستا جەمەدییە
ئەڤرو مابەینا هەردوو مەمکا
نەرمە زوزانێت دژ وورییە
ئەز بەرێ‌خو ددەمێ
جوتێ مەمکا خودێ پێ دزانیت
شاخێ نێرێ کیڤی‌یە
ئەو قرا گەردەنێ
بەرفێ زوزانێت تورکی‌یە
چل و چار دەرەجا
مێویژا رەش تێدا دیارکرییە
سەرێ ئەرزێنکا وێ شرینە
قالبێ شەکرا بارچیقا دارێتییە
بخودێ ما بەینا هەردوو ریکێت وێ
بجارەکێ ریکێ وێ . .

ئەز بەرێ خو ددەمێ
بەلێ بابو منو ئەنیا وێ
کا و کەمەرە هەیڤا چاردە شەڤێ
لڤێ کاغەزا نەباتییە
هەردوو چاڤێت وێ
گەلاڤێژا لبانگێ سبێ هەلاتییە
بریکێ وێ ئەلیفیە
سەرێ وێ خەلەکە دی بێژی کانێ زێرییە
بخودێ منێ بەرێ خودایێ
سەری هەتا بنێ پێ وێ
من شێلکا سەرێ وێ
دەستێ خو ڤێدا ڤەمالییە
چ عەردێ دەست و تلیکا
ئێما حەمو ڤێکەفتی
رحکا شرین لێ زڤرییە
من گوتێ کچکێ ئەز بتە
تو بشێخ هادی
راموسانەکێ بدەمن پشتی راموسانێ
ناڤێ خوێ درستی
ببێژە بو من چییە
ئەوێ دەست هاڤێت
ل موزا قرکێ ل حمێزی
خال و خەتێ گەردەنێ
هەرسێ دەڤێت سەمائی
بخودێ بەر دەڤێ مندا کێشاییە
کەزیێ خو برەخەکی دانی و لادایە
وەکێ دەڤێ هسانی من ژی
هەر دەڤێ خو هاڤێت لموزا قرکێ
لحمێسی گران من جوتێ سێ
ددانێ بەری دەڤی لێ گڤاشتیە
ڤرچیزا خینێ سەر
دەف و لێڤێت من داهاتیە

گەلەكا خوشبو شرینبو
گوشتی من قەرسی بخودێ
ئەز هاتمە حینێ چاردە سالی یە
عەیب و علەتا قەلبێ من نەمابو
من گۆت بەختێ تەو خودێ
بەس ناڤێ خوراستی ببێژە چییە؟
گۆت كورو مالاتە خرابو
بشێخ هادی ناڤێ من ئیمێ یە
كچا حەموكێ ئێزدییە
ئیمێ ئاخ دەردا بێ دەرمان
هەی كولا بێ سەری
وەی ئێشا زراڤ هەی
مەرەدا سللێ گرێكا مرنی
عەجێبا كەس نەدیت
كولكا پەنجە شێرێ
مەرەدا مرنێ پرسكا زمانی
هەتا ئەز بمرم ملحەما
دەڤێ برینا من ئاخ دەلێ لێ لێ
ئیمێ مالا بابێ تە نە خرابێ
تە مەگرومێ تە مەحرومێ
ئەنی دەڤێ هەی گوهار شورێ
گەردەن كێلێ كەپ زێرینێ
بقامێ نازكێ تەنكێ شلكێ
خشكوكێ نازكێ نازدارێ
پەریكێ حوریكێ مال باب خرابێ
بخودێ ئەزێ دكەم و ناكەم
نزانم دقامەتا خودا چەند شرینێ
ئەزێ بەرێ خو ددەمێ
چارێكا سەعەتێ پێدا
وەزێ رابومە دارێ پیپا
من و ئیمێ دەوات و دیلان هژاندییە
ئەو تاریا مەغربێ
هەتا تاری ب جارەكێ كەفتییە عەردی
بخودێ ئیمێ دەوات بەردابو
ژخالا دلێ من مە پێخولداوەتێ نەدایيە
خودێ خراب بكەت
مالا فەسادا و سەبەب كارێ تلخمسێ
بو بابێ ئیمێ بوختانی گێراییە
بخودێ حەفت رۆژ و حەفت شەڤێت تمام
ئیمێ بابێ وێ دمالێدا هێلای
قەت ژمالێ نە دەركەفتییە
ئەزێ ژ وێرێ وێدا بەرێ خو
ددەمێ عەقلێ من بری
سەودایێ لمن فراندییە
منێ بخورا گۆتی
ئیمێ مالا بابێ تە نە خرابێ
لباژێرێ موشێ حەتا باژێرێ تلخمسێ
وێ بشەوتە وێ كەڤرە
ئەزێ ناچمە باژێرێ موشێ
حەتا باژێرێ تلخمسا شەوتی
بشەوتا دنیایێ بكەڤرا
هەوارە ئیمێ تە جەرگێ من سوتی
مێلاكا من كەركرە
عەقلێ من خرابكرە
بخودێ نەزەرا چاڤا لمن تاریكرە
بەلێ سەرێ من ل كول و كوڤانێ
گران راكرە
هەوارا من بخودێ
حەفت رۆژ و حەفت شەڤێت تەمام
من زاد بچاڤێت سەرێ خو
نە دیت و نە تامكرە
ئیمێ منێ بەرێ خودایێ
تابیتا من یا مرنێ
بەر جنازێ من حازركرە

قەبرێ من کولا بخودێ
کفنێ منێ وا کەرکرە
ئەزێ رابومە دارێ پیا
بخودێ ژنیکو رادبم
حسێبا دلێ خو کری
وەکی کونا دەرزیکێ
من بەر پەنجەرا مالا بابێ ئێمێ
گازی ئێما حەمو کرە
ئەو هاتی بەر سینکێ من
منێ تلیکێ دەستا قیاس کرە
ئەز چومە سوکا چەرخێ
بخودێ حەفت هزار زێری ئوسمانی
من کراس و کورتەکێ
ئێما خو سەرف کرە
ئەزێ زڤریمە بەر سینگی
من سالا کولب و گرانی
شرین بو وەکی شێڤەکا سێڤ شەکرە
وەکی من بەژن و بالا ئێما خو
بکارێ بوکانیێ خەملکرە
من دل نەدا نە بدەستا نە بتلیکا نە بکێرا
نە بگیزانا بخودێ سێ ددانێت بەرێ دەڤی
من هاڤێتنێ ژعەردێ خودێ راکرە
ئەمما گەلەك کولێت دلێ من هەبون
بەس سێ ددانێت بەرێ دەڤێ خو من
هورك هورك هورکرە
وێ گاڤێ کەسێ لوما لمن نەکر من کولێت
دلێ خو پێ دەرمان کرە
ئێمێ ئاخ دەردا بێ دەرمان هەی کولا
بێ سەری وەی ئێشا گران هەی
مەرەدا سللێ گرێکا مرنێ
هەی عەجێبا کەس نەدیت
کولکا پەنجە شێرێ
پرسکا زمانێ من
حەتا مرنێ ئێما منی ئاف. . ئاف. . .

● ئەف دەقە من یێ ژ بەرکاسێتەکێ نڤیسی ژدەنگێ سترانبێژ (نادر سپینداری).

## - ئێمێ -

دەلێ لێ ئێمێ
دەردا بێ دەرمان ئێمێ
ئێشا مرنێ ئێمێ
مەردێ سلێ ئێمێ
ئێشا زراف ئێما من
مەلحەما دەڤێ برینا من ئێما من
دەلێ ئێمێ ئەف چیاێت مە بشەوتن
لڤێ دونیایێ یێ بکەڤرا
ناڤێ ئەشقا (ئێما حامو) گرانە
حەفت سالاّ منێ زاد نەدیت و تام نەکرا
رۆژەکێ منێ گازی ئێما حاموی کرا
بەر سینگێ من کارو کوکێ خو بزێران و
زیڤان کرا
بەر دلێ من شرین بو وەکی
شێڤەکا سێڤ شەکرا
من دل نەدا بدمە بەر کێران و گیزانا
منێ دابو بەر سێ ددانێت بەرێ دەڤێ خو
من حەفت کیزیکر منێ کرە دبەریکا خودا
رۆژا حەفتێ من بسەر
کولا دلێ خو داکرا
ژنوی من ڤتارا خو پێکرا
دەردێ بێ دەرمان ئێمێ
مەرەدا سللێ ئێمێ

ئێشا زراف ئێما من
مەلحەما دەڤێ برینا من ئێمێ
دەلێ لێ ئێمێ
لبەر دەرێ خانیکێ مالا بابێ ئێما حامو
یا ب رپنە
منێ تەماشەکرێ خازگینێت (ئێما حامو)
برەکا سوفی و شێخ و مەلا دەرکەتنە
ددەرێ خانیکێ مالا بابێ م دا چبونە
شێخ و دینو دیت لوێرێ
پسیارکر خانیکێ مالا بابێ ئێمێ
کیشکە من نە دیتیە
وێ گاڤێ شێخ و دینو ژدەردێ ئەشقێ
هایژ خو نینە
دبێتن ئەز نە خەلکێ ڤی وەلاتی‌مە
منێ تەماشەکرێ سێ پیرەکا لسەر تەنیرێ
ئەڤ گوتنەو قسەکرنە
ئێکا دبێژیت عەمرێ (ئێما حامو) چاردەیە
بەرف پانزدێ چویە قەولێ وێ‌وژنە
ئێکا دبێت عەمرێ (ئێما حامو)
پانزدەیە بەرف دوانزدێ سێ هەیڤ مانە
ئێکا دبێت ئێما حامو بچیك و تەفالە
ڤێ گاڤێ بشکوژا سینگە و
بەرێت ئێمێ ڤەکرنە
جوتێ مەمکا سەحکرنە
تازە جوتێ مەمکێت وێ سەرکەتنە
بشکوژ ن هێشت دیار نەبینە
بقەدرێ خودێ هێشتا ئاف تێ نەگەریایە
ڤێ گاڤێ من ب هەردو تلیکێت خو گڤاشتینە
(شێخ و دینو) دبێت کەس بەحسێ
ئێما حامو نەکەن مەلحەما دەڤێ برینا مە
دەردا بێ دەرمان ئێمێ
ئێشا مرنێ‌ء ئێمێ

مەرەدێ سللێ ئێمێ
ئێشا زراف ئێما من
مەلحەما دەڤێ برینا من ئێما من
دەلێ لێ ئێمێ تە مەحرومێ تە مەدرومێ
ئەنی دەڤێ گوهار شورێ
گەردەن زێرێ کەپ زێرینێ
ب قامێ تەنگێ شلکێ نازدارێ چەند شرینێ
ناڤێ گوندێ‌مە مێردینە
منێ دەستێ خودا دوربینا جەرمەنی
منێ تەماشەکرێ داوەتەك لگوندێ‌مە دگێرینە
ئەڤ داوەتە نە لسەرێ‌نە نە لبنی‌نە
منێ بەرێ خودایێ لنیڤەکا باژێری
سێ زەریکا ئەڤ دیلانە گرتینە
ژدینێ خو دئێزدینە
وەکی چاڤێ من ڤێ کەفتی
ئاقل و سەودا دسەرێ من دانەماینە بینە
من سویندخارا ب رەب العالمینێ عالەمێ
ب خسوس ل ئاسمانا ڤرێکرینە ئەردێ
حەبا هەستی دلەشی‌دا نینە
وێ گاڤێ ئاقل و سەدوا
دسەرێ م دا نەمابینە
دەرگەهێ مەجبوریێ لمن ڤەبی
لناف بەینا دوو زیارەتا ڤەکری
سەرێ بژ ور ئێخستینە
بەر بێهنا مسك و عەنبەری و دارچین و
خدرا لدور مەمکێ وێ هاتبە
دفنێت من نە راگرتینە
ئەزێ چومە دەستێ یا دیماهیکێ
یا رەشە موتربە بدلێ من نینە
چومە دەستێ یا ناڤێ گەلەکا جوان بو
هندا درێژ بو منێ
جەمەدانی لسەری نەدیتینە

وەختێ وەزێ چومەدەستێ یا کچکوك
یا تەنك و نازدارو شلك
منێ دەستێ ئێما حامووا گرتی گڤاشتی
منێ سویند خارا ب شێخ هادی دگەلێ کویردا
حەبا هەستی دلەشیدا نینە
وەختێ چوکێ من و ئێمێ دگەل ئێکدا فشابینە
ئاقل و فەهم و سەودا دسەرێ من دا
نەما بینە
دەهول قوتی دارێ خول تڤلێت خودا
دەهول ژ بیرکریە
بەر سینگێ مە وەرگێرا مەقامێ عەرەبیە
وەختێ چوکێ من و ئێمێ دبەر
ئێکدا فشابینە
ئاقل و سەدوا دسەرێ من دا نەما بینە
منێ دەستێ خو هاڤێتە
بنێ بەریکا خو دەهـ زێر تێدا هەبون
منێ کرینە شەباشە
سەر دەهولا موتربی داناندیە

وەختێ منێ دەستێ خو ڤەکێشا
دەستێ من ب مەمکێ ئێمێ کەفتینە
مەمکێ ئێمێ حوگا نینە
سەرێ وا تیژ ن وەکی خەنجەرەکێ حەلەبینە
دەستێ من دور مەمکێ ورێرا ئاسێ بینە
ئاقل و فەهم و سەودا
دسەرێ من دا نەما بینە
چوکێت من ژکەستن
ئاقل ژسەرێ من فری
ئەز بومە مەیتەك
لسەر دەستێ ئێما حامودا
دەستێ ئێمێ مەیتێ من نە راگرتینە
ئەزێ بنیڤەکا وی مەخلوقی کەفتم
عالەمێ ب جارەکێ بۆترەڤێن بمن کەتینە
ئو دەلێ لێ ئێمێ
ئێشا زراف ئێمێ
مەرەدا سلێ ئێمێ
دل کافرێ ئێمێ
ئو ئێما من.

1 ـ من ئەف سترانە یا ژدەڤێ برادەر (محمد سلیم نوح) وەرگرتی خەلکێ گوندێ ئێکمالە بەرواریابە ژیێ وی 32 سالە.

لە سایەی ڕاودێری کردنی سەرۆکی فەرماندە
صدام حسین ڕۆشنبیری کوردی دەگەشێتەوە
ڕۆژی ڕۆشنبیری کوردی
٩ ـ ١١ ـ ٩٨٥

# دواوشه

## ڕۆشنبیریی کوردیو ڕۆژانێکی ڕوناك

● دیاردەیەکی زۆر پێشکەوتوو ودڵخۆشکەرەو، ئومێدی ڕۆژانێکی زۆر پرشنگدارو بەختەوەری پێوەیە، کاتێك هەر ڕۆژێ لە ڕۆژەکانی ساڵ دەبێتە جەژنێك بۆ دیاردەیەکی شارستانیو پێشکەوتوانەو، تیایدا هەموو توانایەك دەخرێتەکار بۆ بایەخ پێدانیو چەسپاندنیو کردنی بە تەقلیدێکی ئاسایی ژیانی گەل.

ڕۆژی هونەرو، ڕۆژی ڕۆژنامە نووس و ،ڕۆژی مافی مرۆڤ و، ڕۆژیسوپاو، ڕۆژی سوپای میللیو ،ڕۆژی لەدایك بوونی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین و ،ڕۆژی یاساناسان و ڕۆژی پۆلیس و، ڕۆژی ئافرەت و ،ڕۆژی پارێزگاکان و ،هەفتەی پاکیو تەمیزی ،فیستیڤاڵی ساڵانەی بەهارو، چەژنی نەورۆزی کوردو. . . جگە لە جەژنە ئاساییەکان. . . هتد ئەمانە ئەو ڕۆژانەن کە خەڵکی عیراقی ئازیزمان تیایدا ئاهەنگ دەگێڕن و ،تیایدا شێوەی ژیانی پڕ بەختیاری نوێی خۆیانی تێدا دەنەخشێنن.

لەلای ئێمەش مەسەلەکە زیاتر گرنگ دەبێ ،کاتێك کە سەرکردایەتی باڵای وڵات بیر لەوە دەکاتەوە ڕۆژێکیش بۆ ڕۆشنبیری کوردی تەرخان بکرێ. . . بێگومان ئەم بیرکردنەوەو بۆچوونە مانای گەلێ گەورە هەڵدەگرێو نیشانەیەکیچاکە بۆ دڵنیابوون لە ڕێگای پاك و بەرین و بێکۆسپی کاروانی ڕۆشنبیری کوردیو، دیاریکردنی ئاسۆی ڕەنگاورەنگ و پڕ ئومێدی.

● ئێمەی ڕۆشنبیرانی کورد هەرگیز لاکردنەوەکەی سەرۆکی خۆشەویست صدام حسینمان لەبیر ناچێ کاتێ هاتە دەزگاکەمان و بەشداری لێکۆڵینەوەی بەرنامەی کاری ئەم دەزگایەی کردو ئەو وتارە بەرزو بەنرخەی دا ،کە بوویە بەرنامەیەکی تێرو تەسەڵ و لەبار بۆ جێبەجێکردنی مافە ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کوردمان.

هەڵبژاردنی ئەم ڕۆژە بۆ ڕۆشنبیری کوردی، جێگەی شانازیمانەو، لە ڕوانگە بیری سەرۆك (صدام حسین)ەوە بەرنامەی کارو کاروانی داهێنان لەمەیدانی ڕۆشنبیری کوردیماندا بەرەو لوتکە دەڕواو لەپاڵ سەرکەوتنەکانی سوپای دلێرمان لەمەیدانی جەنگدا دژی هێرشی نالەباری ڕژێمی ڕەش و فاشیتی خومەینی بۆسەر وڵاتەکەمان. . لەپاڵ ئەو سەرکەوتنانەو خۆراگرتنی پۆڵاینی گەلەکەمان. . . لەهەموو مەیدانەکانی ژیاندا دەگەشێننەوەو پاشەڕۆژی ڕوناك بۆ وڵاتی دێرینی کوردو عەرەب ،عیراقی ئازیز دروست دەکەین.

**عبدالوهاب تاڵەبانی**

بەیان
مجلة ادبية شهرية
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد

رئيس مجلس الادارة ورئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي



**BAYAN**

Litrary Monthly Magazine
Ministry of Culture and Information
Issued by: The Kurdish House for Cultuer and Publişhing
Baghdad - Iraq

EDITOR IN CHIEF

**MUSLEH MUSTAFA JALALY**

نرخی (200) فلسه

دار الحرية للطباعة ـ بغداد